4

ئەو پرسیارانەی ئامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم

# ئامەزرۆی تێگەیشتنی قورئانم

•بۆچی قورئان بە زمانی (عەرەبی)یە؟ •ئایا باشتر نییە تەنیا واتای قورئان بە زمانی کوردی بخوێنینەوە؟ •ئەدی گوێگرتن و خوێندنەوەی قورئان بە زمانی عەرەبی لەکاتێکدا لێی تێنەگەین چ سوودێکی هەیە؟ •ئایا قورئان کۆن دەبێت؟ •چەند موعجیزەیەکی زانستی لە قورئانی پیرۆزەوە. ؟ •ئایا بۆچی درێژترین سوورەی قورئان بەناوی (مانگا)وەیە؟



با پرسیارەکانتان
بێ وەڵام
نەمێننەوە!

ئۆزکان ئۆزە
و ئاوات عبدالله بابان



پەرتووکی چوارەم لە زنجیرەی

(ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم)



# تامەزرۆی تێگەیشتنی

# قورئانم

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: تامەزرۆی تێگەیشتنی قورئانم

نووسەر: ئۆزکان ئۆزە

وەرگێڕ: ئاوات عبدالله بابان

پێداچوونەوە: بەهرە محمدعلی

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٨١٢)ی ساڵی ٢٠١٣ ی پێ دراوە

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا – سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100 - 0750 106 9589 - 0748 013 4669 ara.m@hotmail.com

ARA Media Center

# ئەو پرسیارانەی
# تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم



# پێشەکی



بڕیاربوو پەرتووکی ژمارە چواری زنجیرەی **(ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم)** پەرتووکێك بێت بە ناونیشانی **(تامەزرۆی ناسینی بەهەشتم)** و تێیدا بەدووروودرێژی باس لە بابەتەکانی ژیانی دوارۆژ بکەین، بەڵام لەبەرئەوەی ساڵی ٢٠١٠ لەسەر ئاستی جیهان کرا بە (ساڵی قورئان) لە یادی (١٤٠٠)هەمین ساڵی هاتنەخوارەوەیدا بۆ سەر سنگی مرۆڤ، بڕیارماندا گۆڕانکاریەك لە ڕیزبەندییەکەدا بکەین و پەرتووکی چوارەم لەسەر قورئانی پیرۆز ئامادەبکەین.

بە پێویستمان زانی لەو یادە مەزنەدا، گەرچی بچووکیش بێت چالاکیەکمان هەبێت. گونجاوترین چالاکیش بریتی بوو لە وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێك دەربارەی قورئانی پیرۆز.

بێگومان لە پشووی هاویندا زۆرێکمان ڕوودەکەینە، وانەکانی قورئانی پیرۆز.

دەچینە مزگەوتەکان، لەبەردەم مامۆستایانی ئایینیدا فێری پیتەکان و پاشانیش خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز دەبین.

ئیدی هەر لەو کاتەوە چەندین پرسیارمان لەلا دروست دەبێت سەبارەت بە قورئان. لەوانەش:

بۆچی پێویستە قورئان بخوێنینەوە؟

بۆچی قورئان بە زمانی عەرەبییە؟

ئایا نەدەکرا قورئانی پیرۆز بە زمانی کوردی بوایە؟

ئایا قورئان فێری چیمان دەکات؟

پرسیارەکان بەمشێوەیە دێن و درێژە دەکێشن...

وەڵامی کۆمەڵێك لەو پرسیارانە لە زاری مامۆستایانی میهرەبانەوە دەبیستین. وەلێ هەندێك پرسیار هەن نە ئێمە دەتوانین بیانکەین نە کەسێکیش بەبێ پرسیارکردن بۆمان ڕووندەکاتەوە. بەم جۆرە ئەو پرسیارانە لە مێشکماندا بێ وەڵام دەمێننەوە.

خودی خۆم بەرلەوەی دەست بکەم بە نووسینی ئەم کتێبە، گەڕامەوە بۆ سەردەمی منداڵیم و، بیرم لە هەموو ئەو پرسیارانە

کردەوە کە بە منداڵی دەربارەی قورئان هەمبوون و سەرجەمیانم نووسییەوە.

وەڵامی هەندێك لەو پرسیارانەم زووبەزوو چنگ کەوت، بەڵام هەندێکی دیکەیان کاتێکی زۆریان خایاند. هەربۆیە بە پێویستم زانی کەسانی دیکە کە وەك من لەو جۆرە پرسیارانەیان هەیە هێندە چاوەڕوان نەبن بۆ زانینی وەڵامەکانیان، بۆ ئەو مەبەستەش ئەم پەرتووکەم ئامادەکرد.

بەڵێ، لە چوارچێوەی ئەم پەرتووکەدا هەوڵمدا وەڵامی گرنگترینی ئەو پرسیارانە بدەمەوە، هیوادارم لە نێوەندی ئەوانەدا وەڵامی پرسیارەکانی تۆش هەبن.

هەروەها هیواخوازم پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبە، خۆشەویستی قورئانی پیرۆز لە ناختدا زیاتربێت. قورئانی پیرۆز هەمیشە لە سنگتدابێت و چرای قورئانی پیرۆز ڕووناککەرەوەی ڕێگەی ژیانت بێت...

ئۆزکان ئۆزە

قَالَ تَعَالَىٰ:

﴿الٓمٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾

**"(المر) هەر خودا ئەزانێ مەعنای چیيە. ئەوانە ئايـەتی قورئـانن و هـەموو ئـەو قورئانـەی لای خوداوە بۆت نازڵ کراوە ڕاست و بێگەردە، بەڵام بەشـی زۆری خـەڵك بێئيمـانن چـونكە بيرناكەنەوەو عەقڵيان ناخەنەكار."** الرعد:١

# بۆچی قورئانی پیرۆز
# به زمانی (عەرەبی)یە؟

" کتێبێکه ئایەتەکانی تەفصیل دراون به ئەمرو نەهی و
ئامۆژگاری و ڕێ پیشاندان و یادی خواو حوکمی شەرعی
بابەتی ترو حاڵی وایه به زمانی عەرەبی ئەخوێنرێتەوەو
بۆ کەسانێ که خاوەن فام و هۆش بن." فصلت: ٣

" بەڕاستی ئێمه ئەو کتێبەمان نازڵ کردووه که قورئانێکه به
زوبانی عەرەبی تا ئێوه لێی تێ بگەن و بیزانن." يوسف: ٢

ڕۆژێکی گەرمی وەرزی هاوین بوو، منداڵانی گەڕەك سەرگەرمی یاریکردن بوون، به مەبەستی بەشداریکردن له وانەکانی فێربوونی قورئانی پیرۆزدا کتێبی (ئەلف و بێ)کەم نایه بن دەستم و بەرەو ماڵی مامۆستاکەم کەوتمەڕێ .

کتێبەکەم تایبەتمەندییەکی باشی هەبوو، لەژێر هەموو پیتێکی عەرەبیدا به لاتینیش[1] هەمان پیت نووسرابوو.

---

[1] - نووسەر لەبەرئەوەی خەڵکی وڵاتی تورکیایه، له تورکیا پیتی لاتینی بۆ نووسین بەکاردەهێنن.

کە گەیشتمە ماڵی مامۆستاکەم، بینیم وەك هەمیشە لە گۆشەیەکی باڵکۆنەکەیاندا دانیشتبوو و چاوەڕوانی منی دەکرد.

"وەرە کوڕەکەم وەرە! ئێستا کتێبەکەت بکەرەوە بزانم!"

خانمی مامۆستا، ئافرەتێکی بەتەمەن بوو، چاویلکەیەکی ئەستووری گەورەی لەچاو دەکرد. کاتێك من وانەکەم دەخوێندەوە زۆر بە وریایی چاوی دەبڕیە ڕستەکان و دەستبەجێ هەڵەکانی بۆ ڕاست دەکردمەوە. هەرگیز تووڕە نەدەبوو، هەرگیز بێزار نەدەبوو...

لەکاتێکدا من بە گلەیی و گازندە دەربڕینێکی زۆرەوە دەچووم بۆ وانەی قورئان، کەچی خانمی مامۆستا بەوپەڕی دڵفراوانی و دڵسۆزییەوە وانەکانی دەوتەوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی خوا دەزانێت چەند هەزار جار ئەم کارەی دووبارە کردبێتەوە.

بەبێ ئەوەی بهێڵم مامۆستا درکی پێ بکات هەموو جارێك ڕستەکانم لە پیتە لاتینییەکانی ژێرەوە دەخوێندەوە. مامۆستا خانمیش هەموو جارێك دەستخۆشی لێ دەکردم و دەیوت:

"ئافەرین کوڕەکەم، ئافەرین!" و دەستی دەهێنا بەسەرمدا.



بیستبووم هەرجارێك چاوی دەکەوت بە دایکم، گەلێك وەسفی منی بۆ دەکرد، پێی دەوت کە کورەکەی زۆر بەخێرایی وانەکان فێردەبێت و دەیانخوێنێتەوە.

نزیکی مانگێك بەم جۆرە تێپەڕی.

زۆرجار ویژدانم ئازاری دەدام لەبەرئەوەی ئەو مامۆستا خانمە بەو هەموو دڵسۆزی و بێگەردییەوە هەڵدەخەڵەتاند، شەرمم لە خۆم دەکرد، بەڵام دەستم لەو کارە هەڵنەگرت.

دواجار وانەکانی (ئەلف و بێ) و ژێرنووسی لاتینی[1] تەواوبوو، چەند هەفتەیەك پێش هاوڕێکانم چوومە سەر خوێندنەوەی

---

١- نووسەر خەڵکی تورکیایە، لە تورکیاش پیتی لاتینی بۆ نووسین بەکاردەهێنن.

قورئـانی پـیرۆز... مامۆسـتا دووبـاره دەستخۆشـی لیٚ کـردم؛ "ئافــەرین کوڕەکــەم ئافــەرین! چــەندە زوو چــوویتە ســەر خوێندنەوەی قورئان!"، بـەڵام مـن خـۆم دەمزانـی لـە داهـاتوودا باجی ئەو هەڵەیەم دەدەم.

ئێستا قورئانێکی بە ژێرنووسی پیتی لاتینی لەکویٚ بهێنم!

بۆ ڕۆژی دواتر، بـە نابـەدڵی کتێبـی (ئـەلف و بیٚ)کـەم لەسـەر مێزەکە بەجێهێشت، قورئانەکەم نایـە بـن دەسـتم و بـەرەو مـاڵی مامۆستاکەم بەڕیٚ کەوتم.

"ئەی بابە! دەبێـت ئێسـتا چـی بکـەم؟! ئـای لەدەسـت ئـەم مێشکە پووچەی من!"

یەکەم سوورەتی وانـەی قورئـان سـوورەتی پـیرۆزی (الفاتحـة) بـوو، لەمەیانـدا بــەخت یـاوەرم بـوو، چـونکە مــن سـوورەتی (الفاتحة)م لەبەربوو. هەربۆیە بەبیٚ ئەوەی بهێڵم مامۆسـتا درکـی پـیٚ بکـات خـۆم وا نیشـان دا لەسـەر قورئانەکـە دەیخوێنمـەوە و وانەی ئەو ڕۆژەم تێپەڕاند.

ڕۆژی داهـاتوو دەسـتمان کـرد بــە خوێندنــەوەی سـوورەتی (البقرة).

"بخوێنە ڕۆڵەگیان.."

"ئەلیف لام میم"

ئاخ گیان، ئەم بەشەی ئاسان بوو..

"ئافەرین کوڕەکەم، ئافەرین!"

"زالیکەل کی..."

"بخوێنە ڕۆڵە گیان، بخوێنە و ئارام بە!"

"زالیکەل کیتابووووو"

"بخوێنە کوڕەکەم بخوێنە، دوێنێ چەندە جوان دەتخوێندەوە. ئێستا بۆ وا شڵەژاوی!"

ئەم شەرمەزاریە بەوجۆرە ماوەی هەفتەیەك درێژەی کێشا.

پاشان دەرگای قوتابخانە کرایەوە و، منیش ئاهێکی خۆشیم هەڵکیشا کە لە دەست ئەو دۆخە سەختە ڕزگارم بوو.

بەگوێرەی ئەوەی بیستبووم، خاتوو مامۆستا زۆر دڵگران بووبوو بەو دۆخە.

بە دایکمی وتبوو:

"نازانم چی ڕوویدا، کوڕەکە لەپڕ وای لێ بەسەرهات!"

ماوەی چەند ساڵێك تێپەڕی، دواجار بەداخەوە لەوە تێگەیشتم کە من نەك مامۆستاکەم بەڵکو خودی خۆمم هەڵخەڵەتاندووە.

ناچـار کتێبێکـی (ئـەلف و بـێ)ی منـدالآنم پەیـدا کـرد کـە تێگەیشتنی ئاسان بوو، بە نهێنی شەوان دوور لە چاوی هـەمووان دەستم کرد بە فێربوونی خوێندنەوەی قورئان.

لەهـەر شـوێنێکدا نەمتوانیایـە بیخوێنمـەوە و ئەسـتەم بوایـە، ڕەحمەتم دەنارد بـۆ ڕۆحـی مامۆسـتاکەم کـە ماوەیـەکی زۆر بـوو وەفاتی کردبوو و بە جێگای بڵندی خۆی گەیشتبوو.

(أ، ب ، ت، ث، ج...) بـــەڵێ مـــن بـــەم شـــێوەیە فێـــری خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بووم.

## بۆچی قورئانی پیرۆز بە زمانی عەرەبییە؟

لـەو ڕۆژانـەدا کـە خـەریکبووم مامۆسـتاکەم هەڵدەخەڵەتانـد و خۆم لە فێربوونی قورئان دەدزییەوە، هـەردەمێك ویـژدانم ئـازاری بدامایە و تەنگی پێ هەڵبچنیمایە ئەوا دەمـوت: "خۆزگـە قورئـان بــە زمــانی خۆمــان بوایــە، ئــەوکات دەمتــوانی زۆر بــە جــوانی بیخوێنمــەوە! بەڕاســت بۆچــی بــە زمــانی عــەرەبی هاتۆتــە خوارەوە؟"

بەلاّم لـە ڕاسـتیدا ئەگـەر قورئـانی پـیرۆز بـە زمـانی کـوردی و ڕێنووسی کوردیش بوایە، دیسانەوە لاساریی سـەردەمی منـداڵیم ڕێگـەی نـەدەدا بـە باشـی هەوڵبـدەم بـۆ ئـەوەی فێـری قورئـان خوێندنـەوە ببم. ئـەوە تـەنیا بیانوویـەك بـوو بـۆ سـووك کردنـی ئازاری ویژدانم، بەلاّم ئەوەشم لەبیرناچێتەوە کە پرسیاری: "ئایـا بۆچی قورئان بە زمانی عەرەبییە؟" پرسـیارێکی جـددی بـوو لـە مێشکمدا دەزرنگایەوە.

ئەرێ بەڕاست بۆچی قورئان بە زمانی عەرەبییە؟...

لە ڕاستیدا وەلاّمی ئەم پرسیارە هیچ ئەستەم نەبوو.

پێغەمبـەری ئازیزمـان ﷺ بـە ڕەگـەز عەرەبـە و لـەناو گـەلی عەرەبەوە هەڵبژێردراوە. بێگومـان دەبـوو قورئـانی پیرۆزیـش بـە زمـانی عـەرەبی نـازڵ ببێـت تـاکو هـەم پێغەمبـەر ﷺ و هـەم گەلەکەیشـی لێـی تـێ بگـەن. خـۆ نـەدەکرا قورئانێـك بـە زمـانی کوردی، فەرەنسی یاخود چینی بنێردرێت بۆ خەڵکانێکی عەرەبی زوبان...

ئـەو خودایـەی کـە تێکـڕای ئاسمانـەکان و زەوی بەوپـەڕی حیکمـەت و داناییـەوە دروسـتکردووە، (حاشـا) ئایـا نادانایيـەکی وەهای لێ دەوەشێتەوە ؟

کەوابێ ناچار دەبێت پرسیارەکە بەم جۆرە بکەیت: " بۆچی پێغەمبەر ﷺ لەناو گەلی کورددا هەڵنەبژێردراو لەناو گەلی عەرەبدا هەڵبژێردرا؟"

بەر لەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، وەرە با وادابنێین هەردووکمان موسوڵمانین و خەڵکی وڵاتی چینین. ئەوکات چیمان دەوت؟




"ئایا بۆچی پێغەمبەرﷺ لەناو گەلی چیندا هەڵنەبژێردرا و لەناو گەلی عەرەبدا هەڵبژێردرا؟".

ئەدی ئەگەر موسوڵمانێکی ئەڵمانی بووینایە چیمان دەوت؟:
"ئایا بۆچی پێغەمبەر ﷺ لەناو گەلی ئەڵمانیادا هەڵنەبژێردراو لەناو گەلی عەرەبدا هەڵبژێردرا؟"

وەك دەزانیت ئەمە کۆتایی نایەت، لەبەرئەوەی بۆ هەموو گەلێکی سەر ڕووی زەوی دەکرێت هەمان پرسیار بکرێت...

لەبەرئەوەی ناکرێت هەمان پێغەمبەر کە دوایین پێغەمبەری کاروانی پێغەمبەرانە، لەنێو هەموو گەلەکاندا لە هەمان کاتدا هەڵبژێردرێت و قورئانی پیرۆزیش بە هەموو زمانەکانی دنیا نازڵ ببێت، هەربۆیە پەروەردگاری جیهانیان لەنێو هەموو قاڕەکاندا قاڕەیەك و، لەنێو هەموو وڵاتەکاندا وڵاتێك و، لەنێو هەموو نەتەوەکاندا نەتەوەیەك و، لەنێو هەموو زوبانەکاندا زوبانێك و، لەنێو هەموو ڕێنووسەکانیشدا ڕێنووسێك هەڵدەبژێرێت و پێغەمبەرەکەی و قورئانەکەی بۆ ناو ئەو گەل و نەتەوەیە دەنێرێت و پاشان ئەوان لەناو نەتەوەکانی دیکەی سەر زەویدا بڵاوی دەکەنەوە.

ئەمە هەڵبژاردەی بەدیهێنەری مەزنە و پشکی ئارەزووی هیچ کەسێکی تێدا نییە.

هـەروەك چـۆن ڕەنگـی شـینی بـۆ ئاسمـان و سەوزیشـی بـۆ دارستانەکان هەڵبژاردووە..

هەروەك چۆن باڵی بە باڵندەکان بەخشیووە، لووتی درێژی بـە فیل، بۆنی خۆشی بە گوڵ، ڕەقێتی بە بەرد و ئاسـوودەیی نـاخی بە ئاو بەخشیووە...

هەروەك چۆن مافی ئەوەمان نییە بڵێین: "دە با باڵنـدەکانیش لووتی درێژیان هەبوایە!"، وەهاش ناتوانین بڵێین: " چی دەبـوو لەبری باڵندە، فیلەکان لـە ئاسمانـدا بفڕینایـە!"، چـونکە فیـل و باڵندەش دروستکراوی خوای گەورەن نەك کەسێکی دیکە...

بــە دانــایی خــۆی هــەر گــەلێك بیــەوێت پێغەمبەرەکــەی لێ هەڵدەبـژێرێت و بــە هــەر زوبـانێکیش بیــەوێت کتێبەکـەی نـازڵ دەکات.

هەربۆیە مافی ئەوەمان نییە گلەیی و گازنـدە بکـەین و بڵـێین: "بریا قورئان بە کوردی یاخود بە زوبانێکی دیکە بوایـە"، یـاخود "پێغەمبەر کورد یاخود نەتەوەیەکی دیکە بوایە.."



ئـەوەی دەکەوێتـە سەرشـانی ئێمـە ئەوەیـە بـزانین: "مـادەم خودای تاقانە بـەوجۆرە هەڵیبـژاردووە ئـەوا چـەندین حیکمـەت و دانایی تێدایە. پێویستە هەوڵبدەین و بگەڕێین بـۆ چـنگ خسـتنی هۆکارەکانی ئەو هەڵبژاردنە."

بێگومـان خـودای تاقانـە هـەموو شـتێك بەوپـەڕی حیکمـەت و داناییەوە بەدیدەهێنێت...

خودا زاتی خۆی باشترین زانا و کارایە!

# ئایا باشتر نییە تەنیا واتای قورئان
# بە زمانی کوردی بخوێنینەوە؟

کوردیەکەی قورئان بریتی نییە لە قورئانی کوردی، بەڵکو مەبەست لێی تەفسیر (واتای) قورئانە. وەرگێڕاوی هەر پەرتووکێك، تەنانەت ئەگەر نووسەری کتێبەکە مرۆڤێکیش بێت (واتە کتێبی ئاسمانی نەبێت وەك قورئان، ئینجیل، .. هتد)، هەرگیز وەك نوسخەی ئەو زمانەی پێی نووسراوە دەرناچێت. کاتێك مرۆڤ دەیخوێنێتەوە، لە ناخیەوە ئاوات دەخوازێت و دەڵێت: "خۆزگە فلان زمانم بزانیایە بۆ ئەوەی ئەم کتێبەم بە زمانە ئەسڵییەکەی خۆی بخوێندایەتەوە."

بگرە تەنانەت کەسانێك هەن تەنیا لەبەر خاتری ئەوەی بتوانن بە زمانە ئەسڵییەکەی خۆی کە (فەرەنسی)یە بەرهەمەکانی

(ڤیکتۆر هیوگیۆ) بخوێننەوە خۆیان فێری فەرەنسی کردووە، بەهەمان شێوەش بۆ خوێندنەوەی بەرهەمەکانی (گۆتە) خۆیان فێری زمانی ئەڵمانی کردووە.

ئەگەر بەراوردێك بکەین لەگەڵ وەرگێڕاوی ڕێنووسی ئەسڵیی وتەی خودای تاقانەدا کە قورئانە، ئەمجارە ئیدی جیاوازییەکە گەلێك مەزنتر دەبێت و هاوشێوەی جیاوازی نێوان دەنکە زیخێکی کەنار دەریا و هەسارەیەکی مەزن دەبێت لە قەبارەدا. چونکە لە یەکەمیاندا ئەو زوبانەی ویستی خودای لەسەر بووە و ئەو وشانەی لە دەریای حیکمەتی زاتی ئەوەوە هەڵبژێردراون بەکارهاتوون، بەڵام لە وەرگێڕانەکەیدا زوبان و وشەکاری بەگوێرەی ویست و لێهاتوویی وەرگێڕە...

بۆیە (تەفسیر) خودی قورئان نییە، بەڵکو تەنیا واتاکەیەتی...

بەڵام تکایە وا تێمەگە کە لە نرخی (تەفسێر)م کەمکردبێتەوە! هەرگیز!

تەفسیر زۆر گرنگە. مرۆڤی موسوڵمان لەهەر کوێیەکی دنیادا بژی و بە هەر زمانێك بدوێت پێویستە تەفسیریش بخوێنێتەوە و هەرگیز کەمتەرخەمی تێدا نەکات.

خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

(ئەمەی لەم سورەتەدا نازڵ بوو ئاگادارییەك بوو بۆ خەڵك و، بۆ ئەوە هاتووە حاڵی ببن و پێی بترسێنرێن و بزانن خودای جیهان یەك خودای تاك و تەنیایە. هەروەها بۆ ئەوەیە خاوەن هۆشان بیربکەنەوە.) ابراهیم : ٥٢

واتە قورئانی پیرۆز نە تەنیا كتێبی عەرەبەكانە و نە تەنیا بۆ ئەوانە نێردراوە كە زمانی عەرەبی دەزانن. قورئان كتێبی هەموو مرۆڤایەتییە. هەروەك ئەوەی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ نێردراوە بۆ هەموو گرۆی بەشەر، هەرواش قورئانی پیرۆز كتێبی گشتگیری مرۆڤایەتییە.



بۆیـە لەسـەر هـەموو مرۆڤـەکانی سـەر زەوی پێویسـتکراوە قورئانی پیرۆز بخوێننـەوە هەوڵبـدەن لێـی تێبگـەن. بۆ ئەمـەش پێویستە هەموو مرۆڤایەتی فێری زوبـانی عـەرەبی ببێت یاخود قورئانی پیرۆز وەربگێڕدرێتە سەر هەموو زمانەکانی دنیا.

لەبەرئەوەی بژاردەی یەکەم کـارێکی ئەستەمە، بۆیـە باشـترە قورئانی پیرۆز وەربگێڕدرێتە سەر هەموو زمانەکانی دنیا.

ئێستا ئیدی قورئان بۆ هـەموو زمانـەکانی دنیـا وەرگێـڕدراوە. هەرکەسـێك ئەگـەر موسـوڵمان بێـت یـاخود نـا، دەتوانێـت وەرگێڕدراوی قورئان بخوێنێتەوە.

پێویستە ئەوەش بڵێین کە ڕۆژانـە ژمارەیـەکی زۆر لـە خـەڵکی واتای قورئـان دەخوێننـەوە و لـەو ڕێگەیەشـەوە موسـوڵمانبوونی خۆیان ڕادەگەیەنن.

بۆ وێنە، یەکێك لە بـە ناوبـانگترین گۆرانیبێـژانی پـۆپ لەسـەر ئاستی جیهان بە ناوی (کـات سـتیڤانس)[1] ەوە، دوای ئـەوەی کـە وەرگێـڕدراوی قورئـان بـە زمـانی (ئینگلیـزی) دەخوێنێتـەوە موسوڵمان دەبێت و تەنانەت ناوی خۆیشی دەگۆڕێت بـە (یوسـف

---

١– لەم ڕۆژانەدا گوێم لە ئەلبومی (Roadsinger)ی ئەو هونەرمەندە دەگرت، بەڕای من بەرهەمێکی ناوازەیە...

ئیسلام)، ئەمە بە تایبەتی پاش خوێندنەوەی سوورەتی یوسف کە یەکێکە لە جوانترین چیرۆکەکانی ناو قورئان.

بەڵێ، قورئانی پیرۆز موعجیزەیەکی هێندە مەزن و بێ هاوتایە کە وەرگێڕدراوەکەشی دەبێتە هۆی باوەڕپێهێنانی ژیرییەکان و، ئاودانی ڕۆحەکان و گێڕانەوەی مرۆڤەکان لە هەڵدێر.

بە وێنەی خۆرێکی درەوشاوەی هەرگیز نەکوژاوە، قورئان لەسەر ئاوێنەی زمانە جیاوازەکان دەدرەوشێتەوە و ئایەتەکانی دەبنە هۆی گەرموگوڕکردن و ڕۆشنکردنەوەی دڵەکان.

## ئایا خوێندنەوەی واتای قورئان بەس نییە؟

بۆ چوونە ناو کۆشکێکی مەزنەوە کە بە خەزێنەو خشڵ و کەرەستەی گرانبەها داپۆشرابێت و جێی باس و خواسی هەمووان بێت، پێویستە سەرەتا بەرەو دەرگای کۆشکەکە بچین و پاشانیش لە دەرگای کۆشکەکە بدەین.

بێگومان دەروازەی کۆشکێکی وا ناوازە، بە هەمان شێوە ناوازەیە...

وەلێ جوانی ئەم دەرگایە تەنیا سەرەتایەکە بۆ جوانیەکانی دوای خۆی، کە جوانی کۆشکەکەیە.

کەسێك بخوازێت بچێتە ناو کۆشکەکەوە پێویستە لە دەرگا بدات و پاشان بە دەروازەکەدا تێپەڕێتە ناو حەرەمی کۆشکەکە.

بەڵێ، واتای قورئانی پیرۆزیش وەك دەروازەیەك وایە بۆ چوونە ناو قورئان. بەبێ تێپەڕاندنی ئەو ناکرێت بچینە ناو کۆشکەکەوە.

وەلێ ئەگەر بتەوێت زیاتر لە کۆشکەکە وردببیتەوە و، خەزێنە لە بن نەهاتوو و کەرەستە گرانبەهاکانی ناوی ببینیت، ئەوا پێویستە بچیتە ئەودیو سنووری واتا (وەرگێڕدراو)ی ئایەتەکانەوە.

هەر بۆیە چەندین سەدەیە زانایانی ئایینی بە دەیەها بەرگی مەزن تەفسیریان نووسیوە. تەفسیرەکان بریتین لە چەند پەرتووکێکی ڕێنمایی کە ئایەت بە ئایەت بە کۆشکی مەزنی قورئانمان دەگەیەنن. لەو تەفسیرانەدا واتای قووڵی ئایەتەکان ئاشکرا دەکرێن، ئەمەش شتێکی جیاوازە لە (وەرگێڕدراو) یاخود واتای ئایەتەکان.

نموونەیـــەکی دیکـــەت لەســـەر بابەتەکـــە بـــۆ دەهێنمـــەوە: وەرگێڕدراوی قورئان لە چینی ڕووپۆشی دەریـا دەچـێت. ئـەوەتا کاتێك سەیری دەریا دەکەین شینایی دەریا و جموجووڵ و بریقـە دانەوەی لەبەر تیشـکی ڕۆژ و مانگـدا دەبیـنین. بـەڵام خـۆ لامـان ئاشکرایە، دەریا تەنیا ئەمە نییە. بەڵکو یەکجار قووڵ و فراوانە.



دەریا بە ملیۆنان گیانلەبەر و مروارى و مەرجانەکانیەوە، جیهانێکی تەواوە.

زۆر لەوەی کە لە دەرەوە دیارە جیاوازتر و جوانترە...

بەڵێ! واتای قورئانیش وەك ڕووی دەریا وایە. بەوپێیەش ئەگەر بڵێیت "من واتای کوردی قورئانم خوێندۆتەوە! ئەمە بەسە بۆ من. هەرچەند لەوە تێبگەم بەو ئەندازەیەش پەیڕەوی دینەکەم دەکەم"، بەڕاستی ئەم وتەیەت ناتەواوە.

خوێندنەوەی واتای قورئان کارێکی پێویستە، دەبێت بەرهەمی ئەو زانا پایەبەرزانەی لە ڕابردوو و ئێستە و داهاتوویشدا، ڕوونکردنەوەی بەنرخیان لەسەر ئایەتەکانی قورئان و فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەرمان داوە و دەیدەن، بخوێنینەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە خۆمان قورئان بخوێنینەوە.

ئیتر ئەوکات پشکمان لە خەزێنەی کۆشکی قورئان و جوانیەکانی دەریای قورئان زیاد دەکات...



# ئەدی گوێگرتن و خوێندنەوەی قورئان به زمانی عەرەبی لە کاتێکدا لێی تێناگەین، چ سوودێکی هەیە؟

**" ئەی خەڵکینە ! بە ڕاستی قورئانێکتان بۆ هاتووە پڕیەتی لە ئامۆژگاری و، ڕێگای ڕاستتان پیشان ئەدات بۆ قازانجی دین و دنیاتان، ئەمرتان پێ ئەکا بە چاکە و نەهیتان ئەکا لە خراپە، کە ئەمانە هەموو شیفای دڵ و دەروونن و، لە گومان و بیروباوەڕی خراپ پاکتان ئەکەنەوە. ئەو قورئانە هۆی شارەزایی و ڕەحمەتە بۆ خاوەن باوەڕە دیندارەکان. "** یونس: ٥٧

پێم وایە ئەگەر شوێنکەوتەیەکی ئایینی مەسیحی بوومایە، گەورەترین پەژارەم ئەوە دەبوو کە نەمتوانیایە کتێبی پیرۆز (ئینجیل)، ئەو کتێبەی لە ڕێگەی سرووشەوە بۆ حەزرەتی عیسا نێردرا، بە زمانە ئەسڵییەکەی خۆی بخوێنمەوە...

چونکە حەزرەتی عیسا بە زمانی عیبری دوواوە و گەلەکەشی بە هەمان زمان قسەیان کردووە. ئینجیلیش هەر بەو زمانە بۆ عیسای کوڕی مریەم نێردراوەتە خوارەوە.

بەڵام بە تێپەڕبوونی کات، هاوشێوەی ناوەڕۆکەکەی، زمانی ئینجیل دەستکاری کراو گۆڕدرا.

سەرەتا وەرگێڕدرا بۆ سەر زمانی یۆنانی. لەدوای ماوەیەك زمانی (لاتینی) وەك زمانی پیرۆز لەلایەن (پاپا)وە ڕاگەیەندرا.

ئەمڕۆ لە ڤاتیکان ئینجیل بە زمانی لاتینی دەخوێنرێتەوە و نزا و پاڕانەوەکانیش هەر بەو زمانە ئەنجام دەدرێن...

بێگومان ئەمەش مایەی خەم و پەژارەیە بۆ پەیڕەوانی ئایینی مەسیحی.

بۆیە ئێمە وەك موسوڵمانان، لەبەرامبەر ئەو دۆخەی مەسیحییەکاندا، هەرچەندە سوپاسی خودا بکەین هێشتا هەر کەمە، چونکە ئێمە تایبەتمەندییەکمان هەیە کە لەوانی دیکەمان جودا دەکاتەوە، ئەویش خوێندنەوەی کتێبە ئاسمانیەکەمانە (قورئان) بە هەمان ئەو زمانەی نێردراوەتە خوارەوە.

زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ لەمەوپێش لە ئەشکەوتی (حراء)دا، فریشتەی گەیەنەری سرووش، لە لایەن پەروەردگارەوە یەکەم ئایەتی قورئانی بۆ پێغەمبەری پێشەوامان هێنا:

﴿اقرء باسم ربك الذی خلق..﴾ واتە بە ناوی خواوە بخوێنە.

ئەمڕۆ موسوڵمانان لە سەرتاسەری جیهاندا، جا زمانی خۆیان هەرچییەك هەیە با ببێت، دەتوانن بە هەوڵێکی کەم فێری خوێندنەوەی قورئان ببن و ئایەتەکان بە هەمان شێوەی خۆیان بخوێننەوە یاخود لە کەسانی دیکەوە گوێیان لێ ڕابگرن.



تەواوی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز چۆن لە خـودای گـەورەوە و لـە ڕێگـەی حـەزرەتی (جبریـل)ەوە گەیشـتونەتە پێغەمبـەر ﷺ، چۆن لە پێغەمبەرەوەﷺ گەیشتونەتە هـاوەڵانی، ئـەمڕۆ لـە دوای تێپــەڕینی ١٤ ســەدە ئێمــەش دەتــوانین بــە هــەمان شـێوە بیانخوێنینەوە.

بەڵێ، ئەمە ئیدی بۆ خۆی بەخششێکی مەزنە و دڵـەکانمان پـڕ دەکات لەخۆشی و شادی...



## زمانی قورئان، زمانی هاوبەشی ئیسلامە

ئەگـەر بێتـو کەسـێکی ئینگلیـز لـە تەنیشـت چـینیەکی مەسـیحیەوە بێـت چـینییەکە ئینجیـل بخوێنێتـەوە، بـەڵام ئینگلیزەکە زمانی چینی نەزانێت، ئەوا ئەستەمە لێی تێبگات.

بەڵام ئەگەر موسوڵمان لە بنەڕەتدا سـەر بـە هـەر ڕەچـەڵەکێك بێت، یاخود بە هەر زمانێك بدوێت، کە قورئانی پیرۆز خوێنرایەوە لێی تێدەگات.

سـەرەڕای ئـەوەش ئەگـەر قورئـانی پـیرۆز بـە دەنگـی بـەرز بخوێنرێتـەوە، ئـەوا بێگومـان کەسـانی چـواردەور ئەگەرچـی مەسیحی یاخود جوولەکە یاخود هیندی بن، بە بیستنی دەنگەکە تێدەگەن کە ئەوە قورئانە و کتێبە پیرۆزەکەی موسوڵمانانە.

ئەگەرچی هاوزمانیش نەبین بەڵام دەستبەجێ لـە چـواردەوری سەدای قورئان خوێندنەوە کۆدەبینەوە...

لەکاتی نوێژەکاندا، هەر ئەوەندەی چاومان بە ئیمامێك کەوت، بـێ یـەك و دوو پـۆل پـۆل لـە پشـتییەوە ڕادەوەسـتین و نوێـژ دەکەین.

هیچ جیاوازییەکی نییە ئەگەر ئیمامەکە کورد، یان تورك، یان عەرەب بێت، فارس بێت، هیندی بێت، یاخود هەر نەتەوەیەکی دیکە... بەڵکو ئەوەندە بەسە ئەو کەسە لەگەڵ سوورەتی (الفاتحـة) دا چەند سورەتێکی دیکەی قورئانی بە ڕەوانی لەبەربێت!

ئیدی ئەمەش یەکێکە لە گەورەترین سوودەکانی خوێندنەوەی قورئان بە زمانی ئەسڵی خۆی کە زمانی عەرەبییە.

## بە ئەندازەی نوێژ خوێندن

گرنگترین پەرستش لە ئایینی ئیسلامدا بریتییە لە (نوێژ). بۆ بەجێهێنانی نوێژیش پێویستە نوێژخوێن لەگەڵ سوورەتی پیرۆزی (الفاتحـة)دا چەند سوورەتێکی کورت یاخود چەند ئایەتێکی لەبەر بێت.

ئەمە لەسەر هەموو موسوڵمانێك فەرزە. وەك دەزانین ئەمە کارێکی هێندە ئەستەم نییە. لەبەرکردنی چەند سوورەتێکی قورئان و فێربوونی چۆنیەتی نوێژکردن، لە لەبەرکردنی خشتەی لێکدان ئاسانترە.

خـوداى گـەورە لـە كۆتـا جـوزئى قورئانـدا، چـەند كورتـە سـوورەتێكى ناردۆتـە خـوارەوە؛ لەوانـەش سـوورەتەكانى (الإخـلاص، الكـوثر، الفيـل... ) دەمـەوێت بڵـێم هـەموو سوورەتەكانى جوزئى كۆتايى قورئان هێندەى سوورەتى (يس) دريژ نين.

بە شێوەيەكى گشتى ئەو سوورەتە كورتانـە لـەكاتى نوێـژدا دەخوێنرێنەوە.

پێدەچێت گوێت لە هەندێ كەسى سەير بووبێت كە دەڵێن: "هەركەسێك دەتوانێت بە زمانى خۆى نوێژ بخوێنێت."، بـەڵام وەك ئاشكرايە كەسانێكى ئەوتۆ گوێيان بۆ ناگرن.

بەتايبـەت نوێـژخوێنان بـە هـيچ جۆرێـك ئـەو وتەيـە بـە هەنـد وەرناگرن.

من وەكـو خـۆم تـاكو ئێسـتە كەسـێكم نـەبينيوە سـكاڵا لـەوە بكات كە لەكاتى نوێژدا ئايەتەكان بە عەرەبى دەخوێنێت. ئايا تۆ بينيوتە؟

لەگـەڵ ئەوەشـدا پێويسـتە مانـاى ئـەو سـوورەتانەى لـەكاتى نوێژدا دەيانخوێنين، بە تايبەتى سوورەتى (الفاتحة)، بزانين.

خۆ ئەگەر نەیشیزانین دەشێت نوێژەکەمان قبووڵ ببێت، بەڵام بە ڕای ئێوە نەنگی نییە گەر بۆ جارێکیش بێت هـەوڵی فێربـوونی واتای سوورەتێکی وەك (الفاتحة) نەدەین کە ڕۆژانە چـەندین جـار دەیخوێنین؟!

خـۆ هەڵـەش نابێـت گـەر بڵـێین، بـۆ فێربـوونی واتـای ئـەو سوورەتانە تەنیا یەك لە هەزاری ئەو کاتە بەسە کە بـۆ فێربـوونی زمانێکی بیانی وەك ئینگلیزی تەرخانی دەکەین.

## خوێندنەوەی قورئان پەرستشە!

خوێندنـەوەی قورئـانی پـیرۆز بـە زمانـە ڕەسـەنەکەی خـۆی (عـەرەبی) پەرستشـێکە مایـەی پاداشـتێکی مەزنـە. لـەو چوارچـێوەیەدا پێغەمبـەری خۆشەویسـتمانﷺ هـەواڵی ئـەوەمان پێدەدات کە خوێندنەوەی هەر پیتێکی قورئانی پیرۆز پاداشتی خۆی هەیە. بگرە ئەو پاداشتە لە مانگی ڕەمەزان و بە تایبـەتیش لە شەوانی قەدردا چەندین جار زیاد دەبێت.

واتە خوێندنەوەی قورئـان عیبـادەتێکی بەسـوودە و هێنـدەی ئەوەش کارێکی ئاسانە.. هاوکات گوێگرتن لە قورئان بـە هـەمان شێوەی خوێندنەوەی پاداشتی گەورەی لەسەرە...

لەسەر ئەم بابەتە چەندین فەرموودەی شیرینی پێغەمبـەرمان ﷺ هەیە. بەردەوام ئامۆژگاری گەلەکەی دەکـرد بـۆ خوێندنـەوەو سەرقاڵ بوون بە قورئانی پیرۆزەوە.

**چەند نموونەیەك لەو فەرموودانە:**

"باشـترینتان ئـەو کەسـەیە کـە قورئـان فێردەبێـت و فێـری کەسانی دیکەشی دەکات".

"هەرکەسـێك هـیچ شـتێك لـە قورئـان نـەزانێت وەك مـاڵێکی وێرانەیە"

"هەرکەسـێك پیتێـك لـە قورئـان بخوێنێتـەوە چـاکەیەکی بـۆ دەنووسـرێت. جیـا لـەوەش بـۆ هـەر چـاکەیەك دە هێنـدەی بـۆ دەنووسرێت. ناڵێم (الم) یەك پیتە. بەڵکو (أ) پیتێك و (ل) پیتێـك و (م)یش پیتێکە"

"ئیمانداری قورئانخوێن وەك لیمۆ وایـە، بـۆنی خۆشـە و تـامی بەلەزەتە. ئیمانداری قورئان نەخوێنیش وەك خورمـا وایـە، تـامی خۆشە بەڵام بۆنی نییە".



# ئایا ئەگەر قورئان وتەی خوای گەورەیە، بۆچی کەمێك لە قسەی مرۆڤ دەچێت؟

**" جا بۆیە ئەم قورئانەمان بە زمانەکەی تۆ کە زمانی عەرەبییە ناردووە بۆ خەڵك، یا بۆیە لەسەر زمانی تۆ، واتە لە ڕێگای تۆوە، ناردوومانە بۆ خەڵك بۆ ئەوەی مژدەی پێ بدەی بە لەخواترسان و ئەو کەسانەی پێ بترسێنی کە کەللەڕەق و سەختگیرن لە دوژمنایەتیدا. "** مریم: ٩٧

ئەو خودایەی کە نیعمەتی ئاخاوتنی ئێمە بەخشیوە، بێگومان زاتی خۆیشی دەدوێت، وەلێ قسەی خودا لە قسەی ئێمە ناچێت. چونکە ئێمە بۆ قسەکردن زمان و، لێو و، ناوەندی هەوا کە توانای گواستنەوەی وزەی دەنگی هەیە و چەندین کارلێکی ئاڵۆزی مێشکمان بەکاردەهێنین.

ئەگەر ئاخاوتنی خودای گەورە لە ئاخاوتنی ئێمە بچوایە ئەوکات زاتی ئەویش پێویستی بە هەمان ئەم ئەندامانە دەبوو کە

ئێمە بەکاریاندەهێنین، بەڵام خودای مەزن بەرلەوەی هیچ بوونەوەرێك هەبێت هەر هەبووە و هەر پەروەردگار بووە.

زاتێك کە بەر لە بوونی هەموو بوونەوەران بوونی هەبووە، بێگومان نیازی بە هیچ شتێك نییە.

نە بۆ ئاخاوتن، نە بۆ بیستن، نە بۆ بەدیهێنانی بوونەوەران پێویستی بە هیچ شتێك نییە...

ئەدی باشە زاتێك کە وتەکانی لە وتەی مرۆڤ ناچێت، چۆن دەکرێت کتێبەکەی واتە قورئان لە وتەی مرۆڤ بچێت؟ مادەم خودای گەورە خۆی لە هیچ شتێکی دیکە ناچێت، ئەدی نابێت فەرموودەکانیشی، جیاوازبن؟

هەروەك چۆن چاوی مرۆڤ توانای بینینی تەواوی ڕەنگەکانی تیشکی ڕووناکی نییە، بەو جۆرەش گوێچکەی توانای بیستنی هەموو شەپۆلێکی دەنگی نییە.

ئەگەر گوێچکە بشبیستێت، مێشکمان ناتوانێت لێی تێبگات...

بۆ نموونە، دەتوانین گوێمان لە ئاخاوتنی مێش هەنگەکان بێت، بەڵام ناتوانین لێیان تێبگەین...

بانگهەڵـدانی باڵنــدەکانیش لای ئێمــە تــەنها چــەند ئــاوازێکی خۆش و هەست بزوێنن. واتە ناتوانین بزانین باڵنـدەکان لـە نێـوان خۆیاندا باس لە چی دەکەن و لای ئەوان چ باسە...

ئەمانە لـە لایـەك، لـە لایـەکی دیکـەوە ئەگـەر زمـانێکی بیـانی نەزانین تەنانەت ناتوانین لە مرۆڤێکی بیانیش تێبگەین...



ئێمە تەنیا دەتوانین لەوانە تێبگەین کە وەك خۆمـان دەدوێـن. بێگومان گوێچکە و، مێشك و دڵیشمان بەو پێیە بەدیهێنراون...

بۆیـە ئەگـەر بێتـو پـەروەردگاری مـەزن بـە زمـانی خۆمـان لەگەڵماندا نەدوایە، بە زمانێك کە لە ئاستی خودایەتی زاتی ئەودا بێـت قسـەی لەگـەڵ بکردینایـە، ئـەوکات نەمانـدەتوانی لـە فەرمایشتەکانی تێبگەین.

لێـرەدا دوو ڕێگـە هەیـە بـۆ تێگەیشـتن لـە فەرمایشـتەکانی پەروەردگار. یەکەم ئەوەیە دەبێت ئێمە بگەینە ئاستێکی هێنـدە باڵا کـە لـە فـەرموودەی خـوای گـەورە تێبگـەین، یـاخود ئـەوەی خودا بە سۆز و میهرەبانی خۆی بە زمانێك لەگەڵماندا بـدوێت کـە لێی تێبگەین.



لەبەرامبەردا خودای پەروەردگار زمانێکی هەڵبژارد بۆ ئاخاوتن که مرۆڤەکان لێی تێبگەن. –هەروەك چۆن دایك بە زمانێکی وا سادە لەگەڵ منداڵەکەیدا دەدوێت کە لێی تێبگات–.

ئایا ئێوە دایکێکتان بینیوە قسە لەگەڵ منداڵە بچووکەکەیدا بکات؟

ئەگەرچی دایکەکە پرۆفیسۆری کۆلێژی زمانیش بێت هەرگیز نایەت بە شێوەیەکی پرۆفیشناڵ و لە ئاستێکی بەرزدا قسە

لەگەڵ منداڵەکەیدا بکات، بەڵکو بە شێوەیەکی وا سادە قسە دەکات لە منداڵە ئاتاجەکەی بتوانێت زۆر بە ئاسانی لێی تێبگات.

دایك هەموو زانست و زانیاری خۆی و، گشت ئەو وشە ئەدەبییانەی دەیانزانێت و تەواوی هونەرەکەی دەخاتە لایەك و هەوڵ دەدات سادەترین زمان لەگەڵ منداڵەکەیدا بەکاربهێنێت. بۆ نموونە لەکاتی تێرکردنی جگەر گۆشەکەیدا ناسکترین و سادەترین زمان بەکاردەهێنێت.

کەسێك، بە مەرجێ ئاگاداری خۆشەویستی نێوان دایك و جگەرگۆشەکەی نەبێت، بە هیچ شێوەیەك ناچێتە ئەقڵییەوە ئەو دایکە پرۆفیسۆری بەشی زمان بێت لە زانکۆ. لەوانەشە بڵێت: "ئەم قسانە هەرگیز قسەی مامۆستایەکی بەشی زمان نییە".

کەسێك ئەگەر گوێی لە قورئان خوێندن بێت و بڵێت: "ئەمەیش وەك وتەی مرۆڤ چەند وتەیەکە، ئەمە کەی فەرموودەی خودایە.؟ ئەگەر فەرموودەی خودا بوایە بەمشێوەیە دەبوو؟ ئەگەر فەرموودەی خودا بوایە چەند شتێکی سەرسوڕهێنەر دەبوو!"، هیچ جیاوازیەکی نییە لەگەڵ ئەوەی پێشوودا... ئەو کەسانە تێناگەن لەوەی کە خودای گەورە و

میهرەبان لەبەر بەندەکانی بە زمانێکی سادە و ساکار لەگەڵیاندا دەدوێت تاکو لێی تیبگەن...

ئەو کەسانەی دەڵێن: "ئەگەر ئەمانە وتەی خودا بوونایە، شتێکی تەواو جیاواز دەبوون"

بە هەمان شێوەی ئەوانەن بەرامبەر پێغەمبەر دەیانوت و دەڵێن: "ئەگەر بە ڕاستی پێغەمبەرە، ئەدی بۆچی وەك مرۆڤێکی ئاسایی برسی و تینووی دەبێت، سەرمای دەبێت، ماندوو دەبێت، خەوی دێت و بگرە لە کاتی جەنگدا برینداریش دەبێت؟ ئایا پێغەمبەر نابێت وەك فریشتە بێت؟".

ئەمە لە کاتێکدا پێغەمبەر دەبێت مرۆڤێکی هەڵبژێردراوی نێو مرۆڤەکان خۆیان بێت، مرۆڤەکان پەروەردە بکات، بیانخاتە سەر ڕێگەی ڕاست، لە خووە ناشیرینەکان دووریان بخاتەوە.

ئایا کێ هەیە بتوانێت ڕێچکەی پێغەمبەرێك بگرێت کە بە هەمان شێوەی فریشتەکان نەخوات و نەخواتەوە؟

کێ دەتوانێت بیکات بە سەرمەشق بۆ ژیانی خۆی؟

هاوشێوەی پێغەمبەری ئازیز، قورئانیش بۆ مرۆڤ نێردراوە. قورئان بۆ تێگەیشتن و، پەندوەرگرتن و جێبەجێکردنی ئەو وانانەیە کە لێوەی فێربوون.

" ئەمەی لەم سورەتەدا نازڵ بوو ئاگادارییەك بوو بۆ خەڵك و، بۆ ئەوە هاتووە حاڵی ببن و پێی بترسێنرێن و بزانن خودای جیهان یەك خودای تاك و تەنیایە. هەروەها بۆ ئەوەیە خاوەن هۆشان بیربکەنەوە " ابراهیم:٥٢

## بیروبۆچوونێکی چەوت

کەسانێك هەن نەك لەبەرئەوەی تامەزرۆی فێربوونن، بەڵکو لەبەرئەوەی باوەڕیان بە قورئان نییە یاخود نایانەوێت باوەڕی پێ بهێنن دەڵێن: "قورئان لە قسەی مرۆڤ دەچێت، کەواتە فەرموودەی خودا نییە. بەڵکو کەسێك هەستاوە بە نووسینی". لێت ناشارمەوە ئەمە فەلسەفەیەکی کلاسیکیم وەبیردەهێنێتەوە کە دەیوت: "تیژی بیبەر بەسوێیە، ژیانیش بەسوێیە، کەواتە ژیان بیبەرە."

بەڵێ، قورئان لە قسەی مرۆڤ دەچێت؛ چونکە بە شێوازێك بۆمان نێردراوە کە مرۆڤ لێی تێبگات.

ئەگەر بە شێوەیەك بوایە کە مرۆڤەکان لێی تێنەگەن و پاشان نەزانن چۆن لە ژیانیاندا سوودی لێ وەربگرن، ئەوکات ناردنی کتێبی ئاسمانی لەلایەن خالقەوە بۆ بەندەکانی چ مانایەکی دەبوو؟.

کتێبێك کەس نەتوانێت بیخوێنێتەوە و، کەس نەتوانێت لێی تێبگات و، تەنانەت کەس توانای ئەوەی نەبێت گوێی لێبگرێت، بێگومان ئەو کتێبە سوودی بۆ کەس نابێت.

بۆ نموونە ئەگەر قورئان وەك ئەو گفتوگۆیەی حەزرەتی موسا و پەروەردگار بوایە لە کێوی (طور) لە سینا، هیچ بەندەیەکی خودا نەك هەر تێنەدەگەیشت بەڵکو تەنانەت توانای گوێگرتنیشی نەدەبوو.

# وشەکان هەمان وشەن بەڵام...

ئێستا پێدەچێت چەند پرسیارێکی لەم شێوەیەت لەلا دروست ببێت. ئەگەر قورئان بە زمانێك کە مرۆڤەکان لێی تێدەگەن نێردراوە، ئەی بۆچی بە بێ هاوتا و تاك ناودەبرێت؟ بۆچی ئاشکراکردنی نهێنییەکانی سەختە؟ بۆچی موعجیزەیە؟ یاخود لەبەرچی ماوەی چەندین سەدەیە تەنیا ئایەتێکیشی کەمی نەکردووە؟

وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە لە بەشەکانی داهاتووی ئەم پەرتووکەدا چنگ دەخەیت.

وەلێ ئێستا تەنیا دەمەوێت بڵێم: "

ئێمە لە گڵ چی دروست دەکەن؟

قاپ و قاچاخ و گوڵدان و ئینجانەی سیرامیك و ئەم شتانە، وانییە؟

باشە ئەگەر بپرسین، خودا لە هەمان گڵ چی دروست دەکات؟

میوەکان، درەختەکان، سەوزەکان دروست دەکات... هەنجیر و هەنار و زەیتوون دروست دەکات...

باڵنـــده و گیانلەبـــەران دروســـت دەكـــات.. و دواجـــار مـــرۆڤ بەدیدەهێنێت.

بەڵێ، وەك دەبینین لەنێوان هونەری ئێمـە و خـودادا جیـاوازی ناكۆتا هەیە.

بە هەمان شێوە، بیر لە وشە و دەستەواژەكان بكەرەوە...

هـــەزاران ســـاڵە مرۆڤـــەكان ڕۆمـــان و چـــیرۆك و هـــۆنراوە و پیاهەڵدان و لاوك بەو پیتانە دەهۆننەوە.

لـە بەرامبەریشـدا بڕوانـە ئـەو قورئانـەی خـودای گـەورە بـۆ پێغەمبەرەكەی ناردووە و لە هەمان ئەو پیتانە پێكی هێناوە!

ئەگەرچـی پەیڤـەكان هـەمان پـەیڤ بـن، بـەڵام جیـاوازی بـێ ئەندازە لەنێوان فەرموودەی خودا و وتەی مرۆڤدا هەیە.

هەربۆیە جێی خۆیەتی بڵێین سوپاس بۆ ئەو خوایەی خـاوەنی سۆز و میهرەبانی بێ سنوورە و لە ڕێگەی پێغەمبەرەكەیـەوە كـە محەمـــەدی ئەمینـــە كتێبێكـــی بـــۆ نـــاردووین كـــە دەتـــوانین بیخوێنینەوە و لێی تێبگەین، دەربارەی هەر ئایەتێكی بـە قـووڵی تێبفكـرین، دەتـوانین لەبـەری بكـەین و لـە ژیـانی ڕۆژانەمانـدا بیكەینە ڕابەرمان، قورئانێك كە بە مزگێنییەكانی دڵخۆش دەبـین و بـە هەڕەشـەكانی دڵمـان دادەخورپێـت، قورئانێـك كـە دنیـا و

دواڕۆژمان به ڕووناکی ئەو ڕۆشن دەکەینەوە و بەهەشت و دۆزەخ هەر له ڕێگەی ئەوەوە دەناسین، لـه هەموویشـی گـرنگتر کتێبێـك که بەدیهێنەری جوانکارمـان پـێ دەناسـێنێت کـه مرۆڤـی لەسـەر جوانترین شێوه بەدیهێناوه!

ئێستا تێگەیشتین قورئان بەخششێکی چەندە مەزنە!

هــاودەمێکی چــەندە بەوەفایــە، خــۆری ڕووناککــەرەوەی ژیانمانەو هەرگیز ناکوژێتەوە و خامۆش ناکرێت...

"الر، ئەم قورئانە کتێبێکە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ لای تۆ تا ئادەمیزاد لـه تـاریکیی گومڕاهییەوە دەربکـەیت و بیبیانخەیتـه نـاو ڕووناکیی شـارەزایی به ئیزنـی خـودای خۆیـان، بۆ ڕێگـای خـودای خاوەن عیززەت و ستایش کراو." ابراهیم:١.



# بۆچی قورئان لەماوەیەکی دووورودرێژی ٢٣ ساڵییدا ڕەوانەکرا؟ ئایا ئەگەر خودا بە یەك جار ڕەوانەی بکردایە باشتر نەدەبوو؟

**" ئێمە ئەم قورئانەمان بەش بەش ناردووەتە خوارەوە تا بە شێنەیی و لەسەرخۆ بۆ خەڵکی بخوێنیتەوەو ئەوانیش بەئاسانی تێی بگەن، ئێمە قورئانمان بە پێی ڕووداوەکان پارچە پارچە ناردووەتە خوارەوە."** الاسراء :١٠٦.

**هەروەك چۆن ئەم پەرتووکە مەزنەی ناوی گەردوونمان لێ ناوە پەڕەپەڕە بەدیهێنراوە، هەرواش کتێبە مەزنەکەی دیکەی پەروەردگار کە قورئانی پیرۆزە بەش بەش نێردراوەتە سەر زەوی...**

**بارانی ئیلهام (سرووش) لە ماوەی ٢٣ ساڵدا باریە سەر دڵی پێشەوامان ﷺ.**

**بۆ تێگەیشتن لە نهێنی ئەمە، پێویستە بچینەوە بۆ ئەو سەردەمەی مەککە -کە یەکەم شوێنی دابەزینی قورئانە- و لە دوورەوە تەماشایەکی بارودۆخی خەڵکەکەی بکەین.**

ڕەوانەکردنی قورئانی پیرۆز هەمووی لە یەك کاتدا دەبووە هۆی دروستکردنی زەحمەتێکی زۆر لای خەڵکی مەککە، چونکە ئەوان ژمارەیەکی ئێجگار زۆر خووڕەوشتی نابەجێیان هەبوو، گەلێك پەیوەستیش بوون بەو ڕەفتارانەیانەوە.

واتە ئەوکات دەبوو لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا فێری هەموو قەدەغەکراوەکان ببوونایە، لەوانە قەدەغەکردنی خواردنەوەی مەی، قومار، بتپەرستی، هتد... ئەمە لەکاتێکدا ئەوان بەدرێژایی تەمەنیان، ژیانیان لەگەڵ ئەو لایەنانەدا ئاوێتە ببوبوو. وەلێ ئاشکرایە وازهێنان لە هەموو ئەو ڕەفتارانە پێکەوە کارێکی ئاسان نەبوو بۆیان. دەرەنجام موسوڵمان بوون بۆ ئەوان شتێکی ئەستەم دەبوو.

بەڵام بەپێچەوانەوە کەم کەم و ئایەت ئایەت وانەیان لە پێشەوامان ﷺ وەردەگرت و، لەبەریان دەکرد و، لێی ورد دەبوونەوە، پاشان لە ژیانی ڕۆژانەیاندا پراکتیزەیان کرد.

ئەو ئیسلامەی ئەوان فێری بوون، ویستی دەرخ کردن نەبوو. بە پێچەوانەوە بە دڵ و بیروهۆشیان بڕوایان پێدەهێنا. بەشێوەیەك لەناخیاندا دەچەسپی، کە ئامادەنەبوون دەستبەرداری ببن، بەڵکو دڵ و مێشکیان هەمیشە ئاوێزانی فەرمانەکانی بوو.



پاشـان، زۆرێـك لـه ئایەتـەكان لەگـەڵ ڕوودانـی ڕووداوێكـدا ڕەوانەدەكران بەو شێوەیەش تێگەیشتن لێیان ئاسانتر دەبوو.

بـەر لـە هـاتنی ئیسـلام هەریـەك لـە خـەڵكی ئـەو سـەردەمە هاوشێوەی تەڵاشەبەردێكی كۆڵانـەكانی مەككـە بـوون، بـەڵام بـە هـۆی ئـەو وانانـەی لـە قورئانـەوە وەریـانگرت هەریەكـە و بوونـە ئەسـتێرەیەكی گەشـی ئاسمـان بـۆ نـەوەی ئـادەمیی چـەندین سەدەی دوای خۆیان تاكو لە قورئان تێبگەن.

ئەگەر تەواوی قورئان پێكەوە نازڵ بوایە، هێندەی منداڵێك كە لە بری قوتابخانەی سەرەتایی بخرێتـە زانكۆ، لەسـەریان قـورس دەبوو.

گومان لەوەدا نییە ئەگەر خودا بیویستایە دەیتوانی بە یەك جار قورئان ڕەوانەی پێغەمبەرەکەی بکات، هەروەك چۆن بە یەك جار تەوراتی ڕەوانەی پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێبێت) کرد.

بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە کە، تەورات بۆ تەنیا گەلێکی دیاریکراو نێردرا، هەرچی قورئانیش هەیە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی نازڵ کراوە.

لەدوای تەورات کتێبی ئاسمانی دیکە نازڵ کران، ئەوانیش (ئینجیل و قورئان)ن بەو پێیەش قورئان دوایین کتێبی ئاسمانییە بۆ مرۆڤ نێردرابێت.

پەروەردگار ڕەوانەکردنی قورئانی پیرۆزی دابەش کرد بەسەر ٢٣ ساڵدا .

لەبەرئەوەی قورئان دوایین پەرتووك بوو، دەبوو شوێنکەوتووانی باش لێی تێبگەن و، باش لە ژیانیانیاندا جێبەجێی بکەن و، بە باشی بیگوازنەوە بۆ نەوەکانی دوای خۆیان.

لەسەردەمی خۆشگوزەرانی واتە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، کەسانی نەیار هەبوون و دژایەتی خودی پێغەمبەر و قورئانەکەشیان دەکرد. ئەوان دەیانوت: "خودا بۆچی دەبێت

پسته پسته قورئـان نـازڵ بکـات؟! دەبـا هـەمووی پێکـەوە بناردایە..".

بێگومان قورئان خۆی وەڵامی ئەو کەسانەی دایەوە.

" کافرەکان وتیشیان: ئەوە بۆ قورئانی بەجارێ بۆ نەهاتووەتە خوار؟ وەڵامی ئەم قسەیەی کافران ئەوەیە بۆیە بە پارچە پارچە ناردوومانەتە خوارەوە تا دڵتی پێ بەهێز بکەین و بتوانی لەبەری بکەی و لەسەرخۆ و بەئارام بۆمان خوێندیەوە تا باش بۆت ڕەوان بکرێ.". الفرقان:٣٢



# ئایا چۆن دەتوانین هێندە دڵنیا بین لەوەی قورئان بە بێ گۆڕانکاری گەیشتۆتە ئێمە؟

" ئێمە خۆمان قورئانمان نازڵ کردووەو هەر
ئێمەیش ئەیپارێزین لەوەی بفەوتێ یا دەسکاری
بکرێ و زیادو کەمی تێدا بکرێ." الحجر:٩

نەك تەنیا موسوڵمانان، بەڵکو پەیڕەوانی ئایینی مەسیحی و، جولەکە و، تەنانەت بێ باوەڕان و هەموو ئەوانەی کە باوەڕیان بە قورئان نییە، بێگومانن لە ڕاستی ئەو هەواڵە!

قورئان بەر لە ١٤٠٠ ساڵ چۆن بووبێت، ئێستەش هەر وایە و گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە. نە سوورەتێکی، نە ئایەتێکی و نە پیتێکی نەگۆڕاوە...

بەڵێ ئەوانەشی پەیڕەوی قورئان ناکەن، دەزانن و دان بەوەدا دەنێن کە بە هیچ شێوەیەك نەگۆڕاوە، چونکە کەس ناتوانێت بانگەشە بۆ گۆڕانی بکات، ئەوەشی بانگەشەی درۆینەی لەو شێوەیە دەکات، لەلایەن خەڵکییەوە بڕوای پێ ناکرێت.

هەرچەندە کەسانێك هەن باوەڕ بەوە ناکەن محەمەدﷺ دوایین پێغەمبەری نێردراوی خودا بێت، بەڵام گومانیان لە ژیانی بێ هاوتا و، بێگەرد و پاکیی ئەو نییە و لە بەرامبەریدا سەری ڕێز دادەنەوێنن. ئەوان بیانەوێت یان نا ناچارن هەروەك چۆن سەبارەت بە پێغەمبەری ئازیز دەڵێن "بەڕاستی محەمەد کەسێکی زۆر مەزن بوو! بگرە مەزنترین کەسی مێژووی مرۆڤایەتیە" هەرواش سەبارەت بە قورئان دەڵێن: "کتێبی موسوڵمانەکان بەر لە ١٤٠٠ ساڵ چۆن بووبێت ئێستەش هەر وایە، سوورەتێکی، ئایەتێکی بگرە یەك پیتیشی گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە..."

دۆست و شوێنکەوتووانی قورئان چەند دڵنیان لەمە، نەیار و دوژمنەکانیشی هێندە دڵنیان.

ئایا ئەگەر بیانتوانیایە پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنن، ئەو کارەیان نەدەکرد؟ ئەگەر لە سەردەمە جیاوازەکانی مێژوودا تەنیا بەڵگەیەکیشیان بدۆزیایەتەوە کە بیسەلمێنێت قورئان گۆڕاوە، ئایا بانگیان هەڵنەدەدا بەگوێی دنیادا؟

ئایا بۆ ماوەی ١٤٠٠ ساڵی ڕەبەق بە بێدەنگی لەبەرامبەر قورئاندا دەستەوەسان دەمانەوە؟



## ئایا قورئان چۆن گەیەنرا بە ئێمە؟

فریشــتەی پەیامبــەر حــەزرەتی (جوبرەئیــل) ســەرەتا کــە ئایەتــەکانی قورئــانی دەگەیانــدە پێغەمبــەر ﷺ، ســەرەتا خــودی پێغەمبەر ئایەتە پیرۆزەکانی لەبەردەکرد. ئەو لەو بابەتەدا گەلێك هەستیار بوو، تەنانەت لە کاتەکانی ســەرەتای هــاتنی سرووشــدا، لــەدوای بیســتنی هــەر ئایــەتێك لــە جیبرەئیلــەوە دەســتبەجێ لــە دوایــەوە دەیخوێنــدەوە. خــودا دەزانێــت، لەوانەشــە ئازیزمــان لەبەرئەوەی ئایەتەکانی لەیاد نەچێتەوە ئەو کارەی کردبێت.

لـەو سـەروبەندەدا، زاتـی پـیرۆزی پـەروەردگار ئایـەتێکی بـۆ پەیامبەرەکەی نارد و خاترجەمی کرد:

" ئەی موحەممەد! زمانی خۆت بە قورئانەکەوە مەجووڵێنـە بـۆ ئـەوەی بەپەلـە بیخوێنیتـەوە –واتـە بەرلـەوەی جیبرەئیـل هـەموو ئایەتەکەت بۆ بخوێنێتەوە، تۆ مەکەوەرە پەلەپەل بۆ ئـەوەی لەگەڵ ئەوا بیخوێنیتەوە تا بێتە بەرت و لەوە مەترسە کە بۆت لەبەرنەکرێ . * بێگومان لەسەر ئێمەیە کۆی کەینـەوە لـە دڵتـاو بـە زمـان پێتـی بخوێنینەوە. ". القیامة: ١٦–١٧

## نووسەرەوە و لەبەرکەرانی قورئان

ژمارەیەك لە یاران هەمیشە هاودەمی پێغەمبەری ئازیزمـان ﷺ بوون. هەندێك لـەوان خوێنـدەوارییان هـەبوو. سـەرەتا ژمارەیـان زۆر کەم بوو، بەڵام بە تێپەڕینی کات ژمارەیان زیادی کرد. ئەوان پێیان دەوترا: (نووسـەرەوەکانی سـرووش) هەریـەك لـەم هاوەڵـە بەڕێزانە پێگەیەکی تایبەتییان هەبوو لە ڕیزی هاوەڵاندا. ئەرکیان بریتـی بـوو لـە نووسـینەوەی ئایەتـە پیرۆزەکـان لـە خزمـەتی پێغەمبـەر ﷺ و لـە ژێـر چـاودێریی ئـەودا. پێغەمبـەرمان ﷺ خوێندنـەوە و نووسـینی ئاسـایی نـەدەزانی، هەربۆیـە ئـەوان

ئایەتـــەکانیان دەنووســـییەوە و پاشـــان بـــۆ پێغەمبـــەریان دەخوێندەوە. لەگەڵ ئایەتەکەدا، هەمیشـە حـەزرەتی جیبرەئیـل زانیـاری بـە پێغەمبـەرمان ﷺ دەدا کـە ئـەو ئایەتـە لـە چ سـوورەتێکدا دەبێـت و ژمارەیشـی چـەند دەبێـت، بۆیـە نووسەرەوەکان ئەو زانیارییانەشیان، تۆمار دەکرد.

پێم وایە ئێستە پرسیاری ئەوەت لە لا دروست بووە، کە ئایا کاغەز و تیانووسیان لە کوێوە پەیدا دەکرد؟!

لەو سەردەمەدا کاغەز نەبوو.

لەگـەڵ نـەبوونی کاغـەزدا، عەرەبـەکانی ئـەو سـەردەمە کلتـوورێکی نووسـینی فراوانـی ئـەوتۆیان نـەبوو، بـەڵکو ڕووداو و بەسـەرهاتەکانیان دەمـاودەم دەگواسـتەوە. بیرمـان نەچـێت خاوەنی توانایەکی باشی دەرخکردن و وەبیرهاتنەوە بوون.

بەڕادەیەك کەسانی وایان هەبوو دەیانتوانی لـە ڕێگـادا لەسـەر پشتی حوشتر بە بێ هیچ تەختەو دانەیەك، لە ئەندێشەی خۆیاندا یـاری شـەترەنج بکـەن. لەبـەرکردنی ئایەتـەکانی قورئـان بـۆ کۆمەڵگایەك بەم زیهنە بەهێزەوە کارێکی ئەستەم نەبوو.

بـەڵێ ڕاسـتە کاغـەز نـەبوو، بـەڵام لەسـەر بـەردی تـەخت و، پێستی ئاسك و توێکڵی درەختی خورما دەیاننووسی.

بێجگـه لـه نووســەرەكان ژمارەیـەك لـە هـاوەڵانیش كاریـان دەرخكردنی ئایەتەكان بوو.

واتە دەتـوانین بڵـێین خـووی جـوانی لەبـەركردنی قورئـان لـەو سەردەمەوە درێژبۆتەوە بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆمان.

ئـەو هاوەڵـە بەڕێزانــە تــەواوی ئایەتــەكانیان لەبــەردەكرد و بەردەوام دووبارەیان دەكردەوە.

ژمارەی ئەمان لە نووسەرەوەكان زیاتر بوو.

وەك پیشتریش ئامـاژەم پێـدا، نـازڵبوونی ئایەتـەكانی قورئـان بەش بەش ئاسانكاری گەورەی كردبوو بۆ لەبەركردن.

تا پێغەمبەری نازدار لە ژیاندا بوو، ئایەتەكانی قورئـان هـەموو پێكەوە كۆنەكرانەوە تـا بخرێنـە سـەر شـێوەی كتێبێـك، چـونكە هێشتا هاتنی سرووش درێژەی هـەبوو. هـەروەها ئایەتـەكان بـەو ڕیزبەندەی ئێسـتا ئێمـە دەیانخوێنینـەوە، نەدەهاتنـە خـوارەوە. واتــە بــەر لــەوەی نــازڵ ببێــت، شــوێن و ژمــارەی ئایەتــەكان نەدەزانرا. ئەگەر قورئان بەشێوەی كتێبێكی تـەواو نـازڵ ببوایـە، هـەر كـە ئایـەتێكی نـوێ بهاتایەتـە خـوارەوە ئـەوكات دەبـوو بـە تەواوی بگۆڕایە و چاپێكی نوێی لێ بنووسرایەتەوە.

لەپاش کۆچی دوایی خۆشەویستمان ﷺ، حەزرەتی ئەبوبەکر دۆستی بەوەفا و ئەمەکداری پێغەمبەر بووە جێگرەوە و خەلیفەی موسوڵمانان.

## مەصحەف

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی حەزرەتی (ئەبوبەکری صدیق)دا چەند جەنگێك ڕوویاندا و دەرەنجام (٧٠) لەو هاوەڵانە شەهید بوون کە قورئانیان لەبەربوو.

ئەم دۆخە بووە مایەی نیگەرانی حەزرەتی (عومەری کوڕی خەتاب) ، کە دووەم خەلیفەی موسوڵمانان بوو. ئەگەر بەو شێوەیە شەهیدبوونی حافیزانی قورئان درێژەی بکێشایە، دوای ماوەیەك کەسێك نەدەما قورئانی لەبەر بێت!

ئیمامی عومەر نیگەرانی خۆی لەو بارەیەوە گەیاندە حەزرەتی ئەبوبەکر.

پاشان قورئان لەسەر شێوەی پەرتووکێك نووسرایەوە.

بەمەبەستی ئەنجامدانی ئەم کارە هاوەڵی بەڕێز (زەیدی کوڕی سابت) کە تۆمارکەری سرووش و حافزی قورئان بوو، ئەرکی پێ

سـپێردرا. لیژنەیـەك بـە سـەرۆكایەتی ئـەو و ئەنـدامێتی چـەند هاوەڵێـك كـە بـۆ سـاتێكیش لـە پێغەمبـەر دوورنەكەوتبوونـەوە پێكهێنرا.

ئەندامـەكانی بریتیـی بـوون لـە: حـەزرەتی عومـەر، حـەزرەتی عەلی، حەزرەتی عوسمان، زەیدی كوڕی كـەعب. ئـەم شـاندە بـۆ مـاوەی سـاڵێك بـە شـێوەیەكی چـڕوپڕ هەسـتیارترین پرۆسـەی جیهانیان ئەنجامدا.



له ڕاستیدا زەید خۆی یەکێك بوو له باشترین حافزانی قورئان لەو سەردەمەدا بەڵام نەیکرد خۆی بە تەنیا قورئان بنووسێتەوە، بەڵکو وتی: "هەر کەسێك دەڵێت سەبارەت بە قورئان شتێك له پێغەمبەر ﷺ فێربووم، داوای لێبکەن بێتە لامان."

هەرکەسێك ئایەتێکی نووسراو یان زیاتری لابووبێت، دەستبەجێ هێناویەتی. ئەوانەشی کە قورئانیان لەبەربوو هاتن و خوێندیانەوە. زەید هەموو ئەو ئایەتانەی بەراورد کرد. بەو شێوەیە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەو شێوەی ئەمڕۆ لەبەردەستی خوێنەرانیدایە، لەسەر پەلی درەختی خورما نووسرایەوە. ئەم یەکەم کۆپیەی قورئان لە سەرەتاوە تاکو کۆتایی دوو جار خوێنرایەوە. بەمجۆرە قورئان، لەسەر شێوەی پەرتووکێك (مەصحەف) نووسرایەوە.

مەصحەف لە سەردەمی سێیەم خەلیفەی موسوڵمانان حەزرەتی عوسماندا چەندین وێنەی لێ نووسرایەوە. پاشان هەر وێنەیەك نێردرا بۆ یەکێك لەو شارە گەورانەی موسوڵمانانی تێدا نیشتەجێبوون. ئاشکرایە لەو سەردەمەدا ئیدی بنکەی دەوڵەتی ئیسلامی گەلێك فراوان بووبوو.

ئەمڕۆ لە وڵاتانی ئیسلامیدا وێنەی زۆر کۆنی قورئانی پیرۆز بوونی هەیە.

بۆ نموونە لە مۆزەخانەی "کلتووری تورکی و کەلەپووری ئیسلامی"ی شاری ئیستانبوڵدا مەصحەفەکانی تایبەت بە حەزرەتی عوسمان و عەلی هەیە. ئەوەی جێی سەرنجە تەنانەت یەك جیاوازی بچووکیش لە نێوان ئەو مەصحەفانە و قورئانە نووسراوەکەی ئەمڕۆدا نییە.

هەروەك چۆن تاکو ئیستا پارێزراوە، قورئان تاکو ڕۆژی دوایی بەبێ ئەوەی یەك پیتی بگۆڕێت دەپارێزرێت چونکە نەك مرۆڤ، بەڵکو خودی زاتی (الله) قورئان دەپارێزێت...

" ئێمە خۆمان قورئانمان نازڵ کردووەو هەر ئێمەیش ئەیپارێزین لەوەی بفەوتێ یا دەسکاری بکرێ و زیادو کەمی تێدا بکرێ." الحجر:٩

# ئایا قورئان كۆن دەبێت؟

(كۆن) جیاوازەو (كۆن دەبێت) جیاوازە. بۆ نموونە خۆر كۆنە، تەنانەت لە گۆی زەوی كۆنترە، بەڵام هەموو سپێدەی بەیانێك سەرلەنوێ هەڵدێتەوە.

هەموو بەیانییەك بە ڕووخسارێكی گەشەوە خۆی نیشان دەدات... بە تیشكەكەی مزگێنی ڕۆژێكی نوێی پێیەو لەسەر ڕووتەختی پەنجەرەی ماڵەكانمان دەبریقێتەوە.

خۆ كاتێك بەیانیان چاومان بە سپێدەیەكی فێنك هەڵدەهێنین، لە ڕاستیدا چاومان بە دنیایەكی نوێدا هەڵهێناوە...

بەڵێ؛ قورئان بە گوێرەی ئێمە كۆنە،بەڵام هەرگیز (كۆن بوو) نییە!

چونكە لە بنەڕەتەوە قورئان "هەرگیز كۆن نابێت"!

# کۆن بوون واتای چیه؟

کۆن بوون، واته شتێك هاوشێوەی ڕۆژی یەکەمی نەبێت. واته ماندووبوون و دارمان، پیس بوون، ترازان، دڕان، ماوه بەسەرچوون، لەدەستدانی کارایی،... هتد.

کۆن بوون شتێکه لەم جۆره.

ئێستا دەپرسین، ئایا دەتوانین کام لەمانه له قورئان که فەرموودەی خودایه نزیك بکەینەوه؟ ئایا دەگونجێت ئاسانترینی ئەم ئاوەڵناوانه بۆ قورئانی پیرۆز بەکاربهێنین؟

هەموو ئەو پێناسانەی بۆ کۆن بوون کردمانن، تەنیا بۆ ئەو شتانه بەکاردەهێنرێن که دەستکردی مرۆڤ خۆیەتی.

بۆ وێنه جلوبەرگ کۆن دەبێت، دەبڕزکێت، دەدڕێت، ڕەنگەکەی کاڵ دەبێتەوه و وای لێ دێت بۆ لەبەرکردن نەشێت...

ئۆتۆمبێل کۆن دەبێت، پارچەکانی تێك دەچن و پاش ماوەیەك وای لێ دێت ناتوانێت خاوەنەکەی له شوێنێکەوه بۆ شوێنێکی دیکه بگوازرێتەوه.

به پێچەوانەوه خاوەنەکەی ناچار دەبێت ئۆتۆمبێلەکەی بۆلای وەرشەی چاککردنەوەی ئۆتۆمبێل بگوازێتەوه.

تەنانەت یاساکانی مرۆڤیش کۆن دەبن. ئەوەی دوێنێ قەدەغە بوو، پێدەچێت ئەمڕۆ ڕێگەپێدراو بێت. یاخود پێچەوانەکەشی دەکرێت ڕووبدات.



یاسا کۆنەکان، یاسای نوێ جێگەیان دەگرێتەوە، بەڵام وەك ئاشکرایە یاسا نوێیەکانیش پاش تێپەڕینی ماوەیەك کۆن دەبن...

دەشێت نموونەیەکی زەقی کۆن بوون لە دنیای کۆمپیوتەردا ببینیت. کاتێك من لە تەمەنی تۆدا بووم، خۆمان دەکوشت و دەبڕی تاکو کۆمپیوتەرێکمان بۆ بکڕن. وەلێ ئێستا هێندە

مۆدێلی نوێی دروستکراوە، بەشێوەیەك كەس لە كۆمپیوتەر ناپرسێتەوە. ئەمە ئیدی كۆن بوونە!

لەبەرئەوەی مرۆڤ بە تێپەڕینی كات هەگبەی زانیارییەكانی زیاد دەبێت، بۆیە ئەو شتانەی دروستیان دەكات، ئەو وتانەی دەیانبیژێت و ئەو یاسایانەی دایان دەنێت، كۆن دەبن.

لەكاتێكدا مرۆڤ شتگەلێكی نوێ فێر دەبێت جێگای كۆنەكانیان پێ دەگرێتەوە، هاوكات لەوەش تێدەگات كە هەندێك لەوانەی پێشتر كردوونی هەڵەبوون... ئێستا نموونەیەكی زۆر ڕوونت لەسەر ئەمە بۆ باس دەكەم.

## مرۆڤ چۆن هاتە سەر زەوی؟

لە كۆندا كاتێك منداڵێك دەیپرسی: "من چۆن هاتومەتە دنیاوە؟"، لەبەرامبەردا گەورەكان لێی تووڕەدەبوون یاخود وەڵامی سەیریان دەدایەوە:

"ڕۆڵە گیان، لەق لەقەكان تۆیان هێنا!"

"ڕۆژێكیان لەگەڵ دایكتدا لەلای ڕووبارەكەوە پیاسەمان دەكرد، لەنێوان بەردەكاندا تۆمان دیتەوە. جوانكیلە بوویت، بڕیارماندا بتهێنینەوە بۆماڵەوە!".



"لـە کێلگەکـەدا لـە سـێبەری کەلـەرمێکی زەبەلاحـدا تۆمـان دۆزیەوە، زۆر جوان بوویت... ! "

لــە ســاڵی ١٩٧٧ دا بــۆ یەکــەم جـار بــە بــەکارهێنانی مایکرۆسکۆپێکی سەرەتایی، (هام) و (لیڤنهۆك) توێژینەوەیەکیان لەسەر خانەی زاوزێی نێر (سپێرم) ئەنجامدا. دەرەنجام بینیـان هەر سپێرمەخانەیەك مرۆڤێکی بە تـەواوی تایبەتمەندییەکانیـەوە هـەڵگرتووە. بــەگوێرەی توێژینــەوەکان، دوای ئــەوەی ئــەم سپێرمەخانەیە دەکەوێتە منداڵدانی ئافرەتەوە پاشان منداڵەکـەی لێ دروست دەبێت.

چەندە سەیرە، تۆش پێت وانییە؟ لەناو سـپێرمێکدا مرۆڤێکـی گچکە هەیە.

"هـام" و "ليڤنهـۆك" دواتـر ئـەوەيان خسـتەڕوو كـە لـەناو سپێرمی مرۆڤە گچكەكەدا ئەگەر كوڕ بێت، دیسـان مرۆڤێكی لـەو گچكەتر هەیە. خۆ ئەگەر ئەمیشیان نێر بێت، لەناو سـپێرمەكەیدا مرۆڤێكی لەخۆی بچووكتر بوونی دەبێت. واتە كارەكە بەم جـۆرە درێژە دەكێشێت!!!

لە سەدەی ١٨دا هێلكەی ئـافرەت دۆزرایـەوە و زانایـان وتیـان پێشتر "هەڵەمان كرد".

چونكە ئەو مرۆڤە گچكانە لەناو خانەی هێلكەی ئافرەتدان نەك سپێرمەخانە.

بـەم جـۆرە مرۆڤایـەتی بـۆ ماوەیـەك سـەبارەت بـە چـۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤ بەهەڵەداچوو.

لـــە ســـەدەی ١٩ دا هـــەنگاوێكی گـــرنگ هـــەڵنرا دەربـــارەی لێكۆڵینەوە لە چۆنیەتی بەدیهاتنی مرۆڤ. ئەوكات ئاشكرا بوو كـە كۆرپەلە لە منداڵدانی دایكدا، لە دەرەنجامی یـەكگرتنی سـپێرمی بـاوك و هێلكـەی دایكـەوە دروسـت دەبێـت. لـەوەش گـرنگتر پێكهاتنی كۆرپەلە لە سكی دایكدا قۆناغ بە قۆناغ ئاشكرا كرا.

واتە بە كورتیەكەی، مرۆڤە بچووكەكان نە بە تەنیا لـە خانـەی زاوزێی پیاودا بوون نە بە تەنیا لە خانەی زاوزێی ئافرەتدا!

بەمجۆرە هەرچی بیروبۆچوون و پەرتووك و تیزی پیشتر هەیە سەبارەت بە بابەتەکە، وەلانران. بەمانای وشە؛ واتە ئەو بۆچوونانە (کۆن بوون)!

بەلێ، کۆن بوون بەم شێوەیە دەبێت. لەدەستدانی ڕەوایەتی، ونکردنی حکومڕانی و چۆکدادان لەبەرامبەر کاتدا بەم شێوەیە دەبێت. بە جۆرێك ئاوڕدەدەیتەوە بەلای ڕابردوودا و بە خۆت دەڵێیت: "چەند لە ڕاستییەوە دووربوون، چەندە جێگەی پێکەنینە! باشە ئێمە ئەم هەموو ماوەیە باوەڕمان بەمانە کردبوو؟"... ئیدی (کۆن بوون)ی ڕاستەقینە ئەمەیە!

## قورئان چی دەڵێت؟

عەجەب، ئایا دەربارەی بابەتێکی گرنگ وەك بەدیهاتنی مرۆڤ، قورئان چی دەڵێت؟ مادەم بکەر زانایە و زانایش مافی لێدوانی هەیە، کەواتە دەبێت ڕاستترین قسە قسەی پەروەردگار بێت. وانییە؟

ئایا لە قورئانی پیرۆزدا کە زیاد لە ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر نێردرا بۆ گرۆی بەشەر ئاماژە بە دروستبوونی مرۆڤ کراوە؟ ئایا ئەوەی لە قورئاندا هاتووە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ئەو دۆزینەوانەی زانایانی بوارەکە پێش ١٥٠ ساڵ ئاشکرایان کرد؟

دروستترین وەڵام بۆ پرسیاری: "ئایا قورئان کۆن دەبێت؟"، زانیارییەکانی بەدیهاتنی مرۆڤە لە قورئاندا. ئەمەش نموونەیەك:

" من ئێوەم لە گڵ دروست کردووە چونکە باوکە گەورەی ئادەمزاد کە ئادەمە لە گڵ دروست کراوە، لەوەپاش لە تۆوی باوك و دایك م دروست کردوون، ئەمجا لە پارچە خوێنێکم دروست کردوون، ئەمجا لە پاچە گۆشتیکم دروست کردوون، هەیەتی خراوەتە شێوەی ئادەمزادەوەو هەیەتی نەخراوەتە شێوەی ئادەمزادەوە، ئەمەتان بۆیە بۆ باس ئەکەم تا بزانن چۆنم دروست کردوون. " الحج :٥

ئەم ئایەتە تەنیا یەکێکە لەو ژمارە زۆرەی ئایەتەکانی قورئان کە باس لە چۆنیەتی دروستبوون و قۆناغەکانی پێکهێنانی کۆرپەلە دەکەن لە سکی دایکدا. لەگەڵ ئەوەشدا هەر قۆناغێك بە لێکچواندنی زۆر جوان نمایش دەکات. ئێستاش پێکەوە واتای یەك بە یەکی ئەو دەستەواژانە شیکار دەکەین.

نوتفه: لـه ڕووی زمانەوانیـەوە واتـە دڵۆپـە ئاوێك. لێـرەدا بـە واتای خانەی نێرینە (سپێرم) یاخود هێلکەی پیتێنـراوی ئـافرەت بەکارهاتووە.

هەریەك لەو دووانەش دڵۆپە ئاوێکن و چیرۆکی ئێمەی مرۆڤ لەو دڵۆپە ئاوەوە دەست پێ دەکات.

**عەلەقــە "خۆهەڵواســەر"**: سەرسـوڕهێنەرترین وێکچـواندن ئەمەیانـــە. چـــونکە عەلەقـــە ٣ مانـــای جیـــاوازی هەیـــەو هەریەکێکیشیان پەیوەندی بە قۆناغێکی گەشەی کۆرپەوە هەیە:

– **خۆهەڵواســین و خۆگرتنـــەوە بـــە شـــوێنێکدا**: هێلکـــەی پیتێنـراوی ئـافرەت واتـە زایگـۆت خـۆی بـە دیـواری منداڵانـدا هەڵدەواسێت و دەگیرسێتەوە.

– **خوێنمـژە**: زایگـۆت بـەبێ وەسـتان کـەرت دەبێـت و زۆر دەبێت، پاشان شێوەی خوێنمژەیەکی گچکە وەردەگرێت.

– **خـوێنێکی مـەییو**: کۆرپەلـە لەبەرئـەوەی لـە سـەرەتادا لـەناوەوە تـۆڕێکی دەمـاری نییـە، هەربۆیـە لـە خـوێنێکی مـەییو دەچێت.

گۆشتپارە: لەم قۆناغەدا کۆرپەلە لە پارچە گۆشتێك دەچێت کە شوێنەواری ددانی بەسەرەوە بێت. هەرچی ئەندامەکانی جەستە هەیە ئیدی وردە وردە لەناو ئەم پارچە گۆشتەدا دروست دەبن.

هەموو ئەم ئایەتانە بەبێ هیچ جیاوازییەك هاوشێوەی دەرەنجامی ئەو توێژینەوە زانستیانەن کە دەربارەی کۆرپەلە ئەنجامدراون.

قورئانی پیرۆز قۆناغ بە قۆناغ دەربارەی چۆنیەتی دروستبوونی کۆرپەلە لە سکی دایکدا، دەدوێت. بەلآم تێگەیشتنی خەڵکی لەمە، کاتێکی دووروودرێژی خایاند.

بێگومان قورئان هەرچییەك لەوبارەیەوە بڵێت ڕاستترینە.

ئەمە هەرچەندە ١٤ سەدە پێش ئێستاش ئەم هەواڵەی دابێت!

واتە ئەو سەردەمەی مرۆڤ نەك هەر هەواڵی لە زانستی کۆرپەلەزانی نەبوو، بەڵکو تەنانەت دەربارەی جەستەی خۆی خاوەنی هیچ زانیارییەکی ئەوتۆ نەبوو...

لەکاتێکدا باوکان منداڵە کچەکانیان زیندەبەچاڵ دەکرد –کە گوایە کچ مایەی نەنگیە بۆ خانەوادە– قورئان لەم جۆرە وانانەی بە مەردووم دەوتەوە.

ئێستا تۆ بڵێ؛ ئایا قورئان کۆن دەبێت، یاخود لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا نوێ دەبێتەوە؟



# چەند نموونەیەك لە موعجیزە
# زانستییەكانی قورئان

هــەروەك چــۆن قورئــان پــەرتووكی خودایــە، گــەردوونیش پەرتووكی زاتی ئەوە. بەڵام كتێبی گـەردوون، كتێبێكـی مەزنـە و بە پیتی خانە و ئەتۆم نووسراوە.

ئافرێنی تاقانە لە قورئاندا گەلێك ئاماژە بە گـەردوون دەكـات. لە چوارچێوەی چەندین باسـی جیـاوازدا باسـی ئـاژەڵان، ڕووەك، چــیاكان، خــودی مــرۆڤ، هەســارەو ئەســتێرەكان، دەریـــاو ڕووبارەكان، با، هەور و باران و باخ و ڕەزەكان دەكـات. ئەمـەش بۆئـەوەی سـەرنجی مـەردووم ڕابكێشـیت، تـاكو لێـی بڕوانێـت و بیربكاتەوە و نهێنییەكانی ببینێت.

بەم جۆرە كاتێك قورئان دەخوێنین سروشت و كاتێـك سـەیری سروشت دەكەین قورئانمان وەبیردێتەوە...

بۆ وێنە کاتێك ئایەتی پیرۆزی: " خودا خستیە دڵی هەنگەوە کە ماڵی خۆتان دروست بکەن لە شاخەکانداو لە قوپۆڵی داردا و لە هەرشوێنێ کە خەڵك بەرزی ئەکەنەوە وەك دارمێوو بن میچ." النحل: ٦٨، دەخوێنین دیمەنی کۆمەڵێك مێش هەنگمان دێتە بەرچاو کە لەناو باخێکی پڕ لە گوڵ و گوڵزاردا دەفڕن.

هەرکاتێکیش کەوچکێك هەنگوین دەخۆین ئایەتێکی قورئانمان وەبیردێتەوە کە باسی هەنگ بکات.

" لە سکی ئەو هەنگانە شەرابێکی ڕەنگاوڕەنگ، زەردو سپی‌و ڕەش، دەرئەچێ لە خواردنەوەیدا شیفا هەیە بۆ خەڵك." النحل: ٦٩.

قورئان و گەردوون، دوو کتێبی ناوازەی خودان کە هەرگیز ناکرێت لە یەکتری جودابینەوە.

ئەگەرچی قورئان کتێبێکی فیزیا، کیمیا، زیندەوەرزانی یاخود جیۆلۆجی نییە -بەوجۆرەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا دەنووسرێنەوە- بەڵام هەواڵدەری موعجیزەکانی سروشتە...

قورئان هەواڵ و سەرگوزشتەی جیاوازی ژیانمان بۆ دەخاتەڕوو لە بچووکەوە بۆ گەورە لەوانەش؛ ئەستێرەکان، هەورەکان، هەورە بروسکە، شنەبای بەیانی، تۆوی درەخت، بەدیهاتنی

هـەنگ و مێروولـە و جاڵجاڵۆکـە، بەسـەرهاتی خۆمـان لـە سـکی دایکماندا، هێڵەکانی پەنجەمان، چیا، دەریا و چینەکانی زەوی...

بـە ئاشـکرابوونی نهێنییـەکانی گـەردوونیش زیـاتر لـە مانـای ئایەتەکانی قورئان تێدەگەین...

لەگـەڵ هـەر دۆزینەوەیـەکی نوێـدا هەڵوێسـتەیەك دەکـەین و دەڵێین: "بەڵێ، ڕاستە تازە زانایـان ئەمـەیان دۆزیوەتـەوە بـەڵام قورئان پێش ١٤٠٠ ساڵ باسی کردووە".

ئەمـەش یەکێکـە لـە مـوعجیزە گـەورەکانی قورئـانی پـیرۆز. چـونکە نیشـانی دەدات؛ لەگـەڵ تێپـەڕینی کاتـدا نـەك هـەر کـۆن نابێت، بەڵکو نوێ دەبێتەوە.

ئێستاش یەك دوو نموونەت بۆ دەهێنمـەوە ئـەوکات باشـتر لـە مەبەستم تێدەگەیت.

## گەردوونی فراوانبوو

هەزاران ساڵ مرۆڤ پێی وابوو گـەردوون وەك گۆیـەکی وەسـتاو وایە. گۆیەکی وەستاوی وەها کـە سـەرەتا و کۆتاییەکـەی دیـاری بێت و شیاوی گۆڕان نەبێت...

بەڵام لە ساڵانی (١٩٠٠)کاندا ئەم بیروبۆچوونە گۆڕا. لە ئەنجامی توێژینەوە زانستیەکان و چاودێریکردنی بۆشایی ئاسمان بە تەلەسکۆبی زەبەلاح و پێشکەوتوو، دەرکەوت کۆمەڵە خۆرەکانی ئاسمان وەستاونین و بەردەوام لە یەکتری دووردەکەونەوە. لەبەر ڕۆشنایی ئەمەدا، زانایان وتیان:

"ئەهای خەڵکینە، ساتێك ڕاوەستن. بە پێچەوانەی ئەوەی پێتان وترا، ئێستا دەرکەوتووە ئەم گەردوونە وەك میزەڵدانێك بەردەوام لە فراوانبووندایە."

لێکۆڵینەوەکان لەوبارەیەوە بەردەوام بوون، دەرەنجام یەکلایی بووەوە کە گەردوون بەردەوام لە دۆخی فراوانبووندایە. ئەم زانیاریەی مرۆڤ تەنیا ١٠٠ ساڵە توانیویەتی پەیی پێ بەرێت، قورئان بەر لە ١٤٠٠ ساڵ ئاماژەی پێکردووە.

لە سورەتی (الذاریات) ئایەتی ٤٧ دا قورئان بەم شێوەیە باسی بابەتەکەی کردووە:

" ئاسمانیشمان بەهێز دروست کردو ئێمە ئەتوانین گەورەتریشی بکەین."

# هەورە سەنگینەکان

وێکچواندنی ئـەو پەڵـە هەورانـەی بەسـەرماندا تێدەپـەڕن بـە شـتێکی دیکـە، کارێکـە هـەموومان حـەزمان لێیـەتی. بـۆ وێنـە؛ هـەورەکان زۆرینـەی کـات وەك چـەند مۆڵێـك لۆکـە لـە ئاسمانـدا دەردەکەون...

وەلێ، مرۆڤ بەدرێژایی چەندین سەدە تەنیا تەماشای ئەو پەڵـە هەورانەی کرد. هیچ زانیارییەکی نەبوو دەربارەیان. هـیچ کەسـێك بۆچوونێکی نەبوو دەربارەی سەنگ و قورسایی ئەو لۆکە مۆڵانـە. خەڵکی دەیانوت: "بەپێی ئەوەی لە ئاسمانداو لـەناو هـەوادا ئـاوا ڕاگیربـوون کەواتــە هـیچ سـەنگێکیان نییــەو هاوشـێوەی لۆکـە سوکن!!"

بەڵام لە ڕاستیدا وانییە.

کاتێـك زانایـان هـەژماری کێشـی ئـەو بارانـەیان کـرد کـە لـە هەورەکانــەوە دەبارێـت، کێشـێکی سـووکی هاوشـێوەی کێشـی (لۆکە)یان بۆ دەرنەچوو. بۆ نموونـە؛ کێشـی تـەنیا ۱ سـەنتیمەتر باران بارین لە ڕووبەرێکی (٥٠) پەنجا کیلۆمـەتر دووجـا فراوانـدا،

نزیکەی نیو ملیۆن تۆن دەردەچێت. بەم شێوەیەش تەنیا یەك پەڵە هەوری باران، دەکرێت ٣٠٠ هەزار تۆن دەربچێت.

قورئانی پیرۆز بەم جۆرە دەربارەی بابەتەکە دەدوێت:

"خودا ئەو خودایە باکان ئەنێریٚ، موژدەی بارانی ڕەحمەتیان پێیە، کە هەوری قورس و زۆریان هەڵگرت بەرەو وڵاتێك ئەیاندەینەبەر کە مردووەو سەوزایی و ژیانی تێدا نییە، لەویٚ بارانی پیٚ ئەبارێنین و، لەو زەوییە مردووەدا هەموو جۆرە بەرو گیایەك ئەڕوێنین" الأعراف :٥٧



# موعجیزەکانی مێش هەنگ

" خودا خستیه دڵی هەنگەوە کە ماڵی خۆتان دروست بکەن لە شاخەکانداو لە قوڕۆڵی دارداو لە هەرشوێنێ کە خەڵك بەرزی ئەکەنەوە وەك دارمێوو بن میچ. " النحل: ٦٨

" جا لە شیرەی هەموو بەرێ بخۆن و ئەو ڕێگایە بگرنەبەر کە خودا بۆی ئاسان کردوون. لە سکی ئەو هەنگانە شەرابێکی ڕەنگاوڕەنگ، زەردو سپی‌و ڕەش، دەرئەچێ لە خواردنەوەیدا شیفا هەیە بۆ خەڵك. بێ‌گومان لە هەنگ و جۆری ژیانی و دروست کردنی هەنگوین و نێرومێیاندا نیشانەی دەستەڵات و توانی خودا هەیە بۆ قەومێ کە بیر بکەنەوە وعەقڵیان بخەنەکار." النحل: ٦٩

مێش هەنگ لەنێو زیندەوەراندا پێگەیەکی تایبەتی هەیە. خودا بە مێشێکی بچووکی ژەهراوی وەك هەنگ، هەنگوینی شیرینمان بۆ بەرهەم دێنێت. لە قورئانی پیرۆزیشدا باس لەم مێرووە نائاساییانە دەکات کە کار دەکەن و بەرهەمێکی گرنگی وەك هەنگوین بەرهەم دەهێنن، وەك پاداشتێك بۆیان. تەنانەت سوورەتێکی قورئانیش هەر بە ناوی (هەنگ)ەوە ناونراوە؛ سوورەتی (النحل). لەم سوورەتە پیرۆزەدا پەروەردگار باسی هەنگمان بۆ دەکات.



کاتێـك لـەو ئایەتـە ورد دەبینـەوە، چـەند سـەرەداوێکمان سەبارەت بە لایەنی هەنگ بۆ دەردەکەوێت...

ئەمەش چەند نموونەیەکە لە موعجیزەکانی هـەنگ کـە قورئـان پێش ١٤٠٠ ساڵ باسی کردووە و تازە بە تازەش مـرۆڤ پـەیی پـێ بردوون:

- زمـانی عـەرەبی زمـانێکی فراوانـە. لـە عەرەبیـدا وشـەیەك ئەگەر بۆ شتێکی نێرینـە بـەکاربێت جیاوازە لـەوەی بۆ مێینـە بەکاردەهێنرێت.

ئایەتەکانی مێش هەنگ ڕووی دەمی لە هەنگە مێینەکانە.

بـەڵێ، تەنانـەت ئـەم وردەكارییـە بچـووكە، موعجیزەیـەكی وەهای قورئانە كە مرۆڤ واقی وڕدەمێنێت لە بەرامبەریدا.

چـــونكە لێكۆڵینـــەوە زانســـتیەكانی ئـــەم ســـەردەمە، دەریانخســتووە كـە تـەنیا هەنگـە مێییەنـەكان بەشـداری لـە بەرهەمهێنانی هەنگویندا دەكەن.

بگـرە هـەموو كارەكـانی نـاو پوورەكەشـی هـەر لـە لایـەن مێینەكانەوە جێبەجێ دەكرێن.

– هەمووان دەزانین هـەنگ لـەم گـوڵ بـۆ ئـەو گـوڵ دەفڕێت. بەڵام بۆ ئاگاداریت هەنگ تەنیا لەسەر گوڵ نانیشێتەوە، بەڵكو لە پێنـاو پێشكەشـكردنی خـواردن بـە ئێمـە، سـەردانی هـەزاران ڕووەكی جیاواز دەكات. لە ڕاستیدا خودی ئەم پرۆسەیە هێنـدەی هەنگوینەكـە بایەخـدارە. چـونكە لـە هـەمان كاتـدا هـەنگ تـۆوی درەختەكان بۆ سەر یەكدی دەگوازێتەوە. بەم شێوەیەش سەوزە و میوەكان زۆر دەبـن. ئەگـەر هـەنگ تـەنیا لەسـەر پـەڕەی گـوڵ بنیشـتایەتەوە، پێدەچـێت ئـەوكات هەنـدێ جـۆری سـەوزە و میوەكانمان هەر نەدیبایە.

ئایەتـەكانی مـێش هـەنگ، سـەرنجمان بـەلای ئەمەشـدا ڕادەكێشن.

چـونکه ئایەتەکـە نافــەرموێت: " جـا لـە شـیرەی هـەموو گوڵـێ بخـۆن " ، بــەڵکو دەفــەرموێت: " جـا لـە شـیرەی هـەموو بـەرێ بخۆن".



(بەروبووم) لێرەدا، بەدەر لـە گـوڵ مەبەسـتی میـوەو سەوزەکانیشە...

– دۆزینــەوەی ڕێگـا و ئاڕاسـتەی نێـوان پـوورەو ئـەو دەیـان باخچـەی گوڵانـەی هـەموو ڕۆژێـك بـۆی دەچـن، خـۆی لـە خۆیـدا موعجیزەیـەکی ئاشـکرایە. هەنگـەکان ئاڕاسـتەی خۆیـان بـەپێی تیشکی خۆر دیاری دەکەن. بەڵام خۆ شوێنی خـۆر بـەردەوام لـە گۆڕاندایە! ئەی چۆن دەگونجێت سـەرەڕای ئەمـە، هـیچ هـەنگێك ئاڕاستەکەی ون ناکات!

مێشکی گچکەی هەنگ بەشێوەیەك بـەدیهێنراوە دەتوانێـت لـە ڕێگای بەکارهێنانی خۆرەوە مەوداو ئاڕاستەی نێوان پوورەکەی و ئەو شوێنەی لێیەتی، دیاری بکات. بە جۆرێك، تەنانەت لـە کـاتی هەوریشدا بە ئاسانی ڕێگای خۆی دەدۆزێتەوە.

لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بە چۆنیەتی دۆزینەوەی ڕێگا کراوە لەلایـەن هەنگـەوە و بـوونی یارمەتیـەکی بەرچـاوی خـودا لــەم

بابەتەدا، بە چەند شێوەیەك كە ژیریی مرۆڤ دەستەوسانە لە تێگەیشتنیدا:



بچۆرە سەر ئەو نەخشانەی پەروەردگار کە دەفەرمووێت: " ئەو ڕێگایە بگرنەبەر کە خودا بۆی ئاسان کردوون ".

بەم پێیەش ئاشکرا دەبێت، دۆزینەوەی ڕێگا و ئاڕاستەی هەنگەکان کە هێشتا مرۆڤ نەیتوانیوە بەتەواوی لێی تێبگات، خودای باڵادەست و زانا بۆی ئاسانکردوون.

– مێش هەنگ دوو گەدەی هەیە. کاتێك هەنگ دەگەڕێتەوە بۆ ناو پوورەکەی ئەو شیلەیەی لە گەدەیدا کۆی کردووەتەوە، دەیکاتە ناو گەدەی هەنگێکی دیکەوە. شیلەکە لە گەدەی هەنگی دووەمدا ساز دەبێت و دەبێتە هەنگوین. واتە هەنگوین لە سکی تەنیا یەکەم هەنگدا دروست نابێت، بەڵکو لە سکی چەند هەنگێکدا دروست دەبێت..

قورئانی پیرۆز بەر لە ١٤٠٠ ساڵ باسی ئەم زانیاریەی کردووە کە بەم دواییە زانایان توانیویانە لێی تێبگەن:



" له سكی ئەو هەنگانە شەرابێكی ڕەنگاوڕەنگ، زەردو سپی‌و ڕەش، دەرئەچی‌ لە خواردنەوەیدا شیفا هەیە بۆ خەڵك".

– ئایا سەرنجت داوە؟ لە ئایەتەكەدا دەڵێت: "لە سكی ئەو هەنگانەوە شەرابێكی ڕەنگاوڕەنگ ، دەرئەچیَ"، ناڵێت: "هەنگوین دەرئەچیَ". ئەدی باشە بۆ واناڵێت؟

ئەو هەنگوینەی لە سكی هەنگدا دەگاتە قۆناغێكی دیاریكراو، دەكرێتە سەر شانەی هەنگوین، بەڵام هێشتا ئەو هەنگوینە نییە كە خۆمان دەیزانین. بەڵكو زیاتر لە شەربەت دەچێت. دوای ماوەیەك خەستتر دەبێتەوە و دەبێت بەو هەنگوینەی بۆ خواردن دەستدەدات.



بەڵێ، قورئان لەپێناو ئەوەی بە وردەکاری تەواوەوە تیشک بخاتە سەر بابەتەکە، لەبری وشەی هەنگوین شیلە یان شەربەتی بەکارهێناوە !

– لە درێژەی ئایەتەکەدا هاتووە: "لە خواردنەوەیدا شیفا هەیە بۆ خەڵك"، وەك ئاشکرایە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ سوود و قازانجی نوێی هەنگوین دەخرێتەڕوو.

هەروەها لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەڵێت: " بێگومان لە هەنگ و جۆری ژیانی و دروست کردنی هەنگوین و نێرومێیاندا نیشانەی دەستەڵات و توانی خودا هەیە بۆ قەومێ کە بیر بکەنەوە وعەقڵیان بخەنەکار ".

## شنەبای پیتێنەرو پاکژکەر

تاکو ماوەیەك لەمەوبەر وا دەزانرا تاکە پەیوەندی نێوان با و باران، ڕاپێچکردنی پەڵە هەورەکانە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی دیکە.

بەڵێ ڕاستە، هەرکەسێك سەر هەڵبڕێت و سەیرێکی ئاسمان بکات هەر ئەوەندەی دەبینێت. بەڵام پەیوەندی ڕاستەقینەی نێوان با و باران ئەمە نییە.

ئەركێكی گرنگ دراوە بە با، ئەویش هەڵگرتنی تایبەتمەندی خڕكردنەوەیە لە ئاسماندا.

با، دەنكۆڵەكانی خوێی كۆبووەوەی سەر ڕووی زەریاكان و، تۆزی بیابان و پرژەی گڕكانەكان كۆدەكاتەوەو بەرەو چینەكانی سەرەوەی بەرگە هەوا دەیانبات. بەم جۆرە هەڵمی ئاو لەناو بەرگە هەوادا ئەو دەنكۆڵانە چڕدەكاتەوە و دووبارە دەبنەوە بە دڵۆپە ئاو. چونكە ئەگەر ئەو دەنكۆڵە تۆزانە نەبن، هەڵمی ناو هەوا جارێكی دیكە خەست نابنەوەو نابنەوە بە ئاو.

بڕوانن قورئان چەندە بە جوانی ئەم بابەتەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە: " باكانمان بە سك پڕی، یا بۆ پێوەندو تەلقیحكردنی دارو درەخت ناردو، لە ئاسمانەوە ئاومان بۆ ناردن و دامانە دەرخواردتان، یا كردمانن بە ئاودێری دارودرەخت و، كشتوكاڵتان بەو ئاوە ئاو دا كە ئێوە خۆتان ئەو ئاوەتان هەڵ نەگرتووەو نەتانكردووەتە چاڵاوەوە." الحجر:٢٢

تایبەتمەندی پیتاندنی با لە جیهانی ڕووەكیشدا خۆی نیشان دەدات.

تۆو و دەنكەهەڵاڵەی هەزاران جۆری ڕووەك لەسەر زەویدا، لە ڕێگای باوە لە دانەیەكیانەوە دەگوازرێتەوە بۆ دانەیەكی دیكەیان

و پیتانــــدن و زۆربوونیــــان ڕوودەدات. بــــەم جــــۆرەش ڕووەك پارێزگاری لە نەوەی خۆی دەكات.



خودای بەدیهێنەر هەندێ جۆری تۆوی بە قورساییەكی هێنـدە كەم بەدیهێناوە كە بە كزەبایەكی نەرم دەگوازرێنەوە. زۆربـوونی گەلێك چەشنی ڕووەك وەك درەختی گوڵدارو گژوگیا، لـە ڕێگـەی باوە دەبێت.

هاوشێوەی تایبەتمەندی گردكردنەوەی دەنكۆڵەكانی تۆز لەناو خۆیدا، ئێمەی مرۆڤ تاكو ئەم سەردەمانەی دوایـیش نەمانـدەزانی با هۆكاری سەرەكی زۆربوونی ڕووەكە.

بەڵام ئافرێنی ئاسمانەکان، هەورەکان، باران و بەفر و تـەرزەو بەدیهێنەری ڕەزو باخ و گوڵ و میوەکـان، خـودای تاقانـە بـەر لـە ١٤٠٠ سـاڵ لــە قورئانــدا ئــەو زانیاریانــەی خســتۆتە بــەردەم بەندەکانی.

**"ئێمـە شـنەبای پیتێنـەرمان نـاردوو (کـە پیتێنـەری دارو درەختە)"**

بێگومان موعجیزە زانستیەکانی قورئانی پـیرۆز هـەر ئەمەنـدە نییە.

بەڵام ئەگەر دانە دانە لێرەدا باسی زۆربـەیان بکـەین، ئـەوکات دەرفەت نامێنێتەوە بۆ وەڵامدانـەوەی پرسـیارەکانی دیکـەت. وا باشترە بە ئومێدی ئەوەی ئەم بابەتە لە پەرتووکێکی تایبەتدا بە درێژیی باسی بکەین.

لێرەدا کۆتایی پێ بهێنین. ئیدی کـاتی ئـەوە هـاتووە وەڵامـی ئـەو پرسـیارەت بدەمـەوە کـە هـەر لـە سـەرەتای ئـەم بەشـەوە تامەزرۆی زانینی دەکەیت:

**"مادەم هێندە موعجیزەی زانسـتی لـە قورئانـدا هەیـە، ئـەدی بۆچـی هەمیشـە کەسـانی ناموسـوڵمان پـەردەیان لەسـەر هەڵدەدەنەوە؟"**

## مادەم هێندە موعجیزەی زانستی لە قورئاندا بوونیان هەیە، ئەدی بۆچی هەمیشە کەسانی ناموسوڵمان پەردەیان لەسەر هەڵدەدەنەوە؟

پێش هەموو شتێك دەبێت بزانین؛ قورئان کتێبی زانیاری نییە. ئەگەر باسی ئاسمان و، ئەستێرە و، با و، چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤ تاکو هێڵەکانی پەنجەی و، چینەکانی زەوی و، مێش هەنگ و باڵی مێش یان شتی هاوشێوەی ئەمانەش بکات، بۆ ئەوە نییە تەنیا ئاماژە بە چەند هەواڵ و زانیاریەکی زانستی بکات. بەڵکو ئامانج لێی دەرخستنی هونەر و کارسازی نەبڕاوەی خودای تاقانەیە...

قورئانی پیرۆز سەرەتا کتێبی دینەکەی ئێمەیە. گەورەترین ئامانجیشی ناساندنی بەدیهێنەرمانە بە ئێمە.

ئەو تێمان دەگەیەنێت کە داخۆ: "ئەو خودایەی ئێمەی مرۆڤی بەم شێوە جوانە و لەم گەردوونە ناوازەیەدا بەدیهێناوە، چۆن خودایەکە؟".

بەر لە هەرشتێك قورئان وەڵامی ئەم پرسیارەمان پێشکەش دەکات و زاتی "الله"مان پێ دەناسێنێت.

ئەگەر ئاماژە بە ئەستێرەکان بکات، ئەوا بێگومان ئاماژە بە نموونەیەك لە دەسەڵاتی خودا دەکات.

ئەگەر باسی هەنگ بکات، ئەوا دەیەوێت باسی وردەکاری هونەری خودا بکات..

ئەو داوامان لێدەکات تێڕابمێنین و بیربکەینەوە و لێی تێبگەین! پێمان دەڵێت: "بۆ کەسانێك بیر دەکەنەوە لەمانەدا بەڵگەی زۆر هەن" و لێمان دەپرسێت: "ئایا هیچ بیر ناکەنەوە؟".

ئەگەر نا قورئانی پیرۆز وەك کتێبی زیندەوەرزانی و، کیمیا و جوگرافیا تەنیا ناڵێت: "ڕووداوەکان بەم شێوەیە یاخود بەو جۆرەی دیکە ڕوودەدەن" و تێبپەڕێت.

هەر لەبەرئەوە کەسێك ئەگەر چی زۆریش قورئان بخوێنێتەوە، نابێت بە کیمیاگەرێك یان زیندەوەرزانێك یاخود کۆرپەلەزانێك.

بۆ نموونـه كاتێـك قورئانخوێنێـك ئـەم ئایەتـه دەخوێنێتـەوە:
"باكانمان به سك پڕی، یا بۆ پێوەندو تـەلقیحكردنی دارو درەخـت نارد" الحجر:٢٢، ئەگەر نەیـەت و توێژینـەوە لەسـەر بـا نـەكات، ئەوا ناتوانێت پەیوەندی نێوان با و بـاران و كاریگـەری بـا لەسـەر زۆربوونی ڕووەك دەربخات.

بەڵكو بە پێچەوانەوە تەنیا زانایەك دەتوانێـت ئاشـكرای بكـات كه توێژینەوە و بەدواداچوون لەو بارەیەوە ئەنجام بدات.
توێژەرێكی زانستی دیكه بەبێ ئـەوەی ئاگـاداری ئایـەتی پـیرۆزی "ئاسمانیشـمان بەهێز دروست كـردو ئێمـه ئـەتوانین گەورەتریشـی بكەین." الذاریات : ٤٧، بێت، دەكرێت لە ئەنجامی چاودێری كـردن و لێكۆڵینـەوەی بۆشـایی ئاسمانـەوە خێـرا لێكدووركەوتنـەوەی كۆمەڵـه خۆرەكـان ببینێـت. لەمەشـەوە بگاتـە دەرئـەنجامی "گەردوون فراوان دەبێت" .

بـەڵام قوتابییـەكی قورئـان كـه چـەندین سـاڵه سـەرقاڵی خوێندنـەوەی ئـەم ئایەتـه پیرۆزەیـه، لەبەرئـەوەی گـەردوونناس نییه ناتوانێـت فراوانبـوونی گـەردوون بـه شـێوەیەكی بەرجەسـته ئاشكرا بكات.



بـەڵام ڕۆژێـك گوێبیسـتی هـەواڵێك دەبێـت گوایـە "زانایـان دۆزیویانەتـــەوە گـــەردوون بـــەردەوام لـــە فراوانبووندایـــە"، دەستبەجێ لە جێی خۆی ڕادەپەڕێت دەڵێت:

"قورئـــان پـــێش ١٤٠٠ ســاڵ لــە ئایــەتی ٤٧ ی ســوورەتی (الــذاریات) دا ئـــەم هەواڵــەی پـــێ داویـــن! بەتێپـــەڕینی كـــات موعجیزەكـانی قورئـان یـەك یـەك ئاشـكرا دەبـن و قورئـان نـوێ دەبێتەوە! چونكە فەرموودەی خودای تاقانەیە!"

بێگومــان ئەگــەر موســوڵمان هــەزار جــاریش ئــەو ئایەتانــە بخوێنێتــەوە کــە پەیوەندیــدارن بــە هەنگــەوە، بــەڵام هــیچ لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر ئەنجام نەدابێت، ئەوا لەو مانایە تێناگات کە قورئان پێمانی ڕادەگەیەنێت.

لەبــەر ئــەوە، هاوشــانی خوێندنــەوەی ئایەتــەکانی قورئــان پێویستە ئەو کەسە شارەزایەکی بواری مێرووەکان بێت و ئایــەتی بەرجەستەی (هەنگ)یش لەنێو پەرتووکی گەردووندا بخوێنێتەوە.



پرسیار لێرەدا ئەوەیە؛ مادەم ئەم ڕاستیانە لە قورئاندا ئاماژەیان پێ کراوە، ئەدی بۆچی ناموسوڵمانان پێش موسوڵمانان درکیان پێ دەکەن؟

ئایا بۆچی هەمیشە ئەو کەسانە ئاشکرایان دەکەن کە قورئان ناخوێننەوە بگرە بڕواشیان پێی نییە؟

وەڵامەکەی ئاسانە! چونکە ئەوان لێی دەکۆڵنەوە! ئەوان لێی ورد دەبنەوە. ئەوان مێشکیان بە هەنگ، مێرووله، ئەستێرە، با... هتد سەرقاڵ دەکەن. بۆیە ئەم دۆزینەوانە دەبێتە پشکی ئەوان.

ئاخۆ ئێمەی موسوڵمان بەدرێژایی ئەم ماوە زۆرە، نەماندەتوانی ئاماژەکانی قورئان و ڕاستیەکانی لە گەردووندا لێکبدەینەوە!

هێندەی سەردەمانی کۆن تەماشای گەردوونی دروستکراوی خودای تاقانە ناکەین. دەڵێم سەردەمانی کۆن، چونکە لە کۆندا موسوڵمانان وانەبوون...

ئەو شارانەی ڕۆشنایی ئیسلامیان پێگەیشتبوو، ناوەندی زانستی بوون لە جیهاندا. چەندین سەدەش ئەو چاخە زێڕینە درێژەی کێشا.




زانایانێـك هـاوڕێ لەگـەڵ خوێندنـەوەی قورئـانی پـیرۆزدا، لەکتێبی مەزنی گەردوونیشـیان کۆڵیـەوە و چـەندین زانیـاری زۆر گرنگیان دۆزییەوە.

ئەوان بە خۆیانیان وت: "مادەم لە کتێبەکەی ئێمـەدا چـەندین ئایـەت دەربـارەی گـەردوون هەیـە، مـادەم قورئـان باسـی ئەستێرەکان، بـا، چیاکان، هـەنگ، دروسـتبوونی مـرۆڤ و چـەند شتی هاوشێوە دەکات، ئایا ناکرێت هـاوڕێ لەگـەڵ خوێندنـەوەی

قورئاندا لێکۆڵینەوە دەربارەی گەردوونیش بکەین؟ ئایا خودی قورئان خۆی فەرمانمان پێناکات تێڕابمێنین و پەند وەربگرین؟"

بێگومان لەبنچینەی ئەو ئاستەی ئەمڕۆ زانست پێی گەیشتووە، هەوڵ و ماندووبوونی بێوچان و تەندروستی ئەو قوتابیانەی قورئان هەیە.

مێژووی زانست پڕە لە چیرۆکی سەرکەوتنەکانی ئەوان...

لەوانەیە تەنانەت ناوی زۆرێك لەوانیشمان نەبیستبێت، بەڵام کاتێك لاپەڕەکانی مێژوو هەڵدەدەینەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەو دەوڵەتەی موسوڵمانان بنیاتیان نا چۆن بە جیهاندا زانست، کلتوور و ژیاری بڵاودەکردەوە. لەوانەش؛ دەوڵەتانی ئەندەلوس، سەلجوقی و عوسمانیەکان بوون.

ئێستاش تەنیا بە کورتی ناو و کاری زانستی ئەو قوتابیانەی قورئانت بۆ دەژمێرم کە لە هەمان کاتدا هەم قورئانیان خوێندووە و هەم بە بیرکردنەوەی قووڵەوە لە گەردوونیان ڕوانیووە.

## لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا...

عەلی کوڕی عەباس (٩٩٤): یەکێکە لەو پزیشکە لێهاتووانەی کە چارەسەری زۆرێك لە نەخۆشییە درێژخایەنەکانی کردووە و، چەندین نەخۆشی هەناوی دەستنیشان کردووە. هەروەها بۆ یەکەم جار باسی لە کۆئەندامی سوڕی خوێن کردووە.

عەمار (سەدەی یازدە): پزیشکێکی موسوڵمانە و یەکەم نەشتەرگەری ئاوی سپی چاوی ئەنجامداوە.

بطانی (٨٥٨-٩٢٩) : یەکێکە لە گەردووونناسە بەناوبانگەکان. داهێنەری زانستی سێگۆشەیە و یەکەم زانایە دەستەواژەکانی (ساین) و (کۆساین)ی بەکارهێناوە.

بەیرونی (٩٧٣-١٠٥١): یەکەم زانایە سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا ئاشکرا کرد.

جابری کوڕی حەیان (٧٢١-٨٠٥): بە باوکی کیمیا دادەنرێت. پێش ١٢٠٠ ساڵ دەریخستووە کە دەتوانرێت ئەتۆم پارچە بکرێت و جیا بکرێتەوە.

جـاحظ (٧٧٦-٨٦٩): یەکێکـە لـە پێشـەنگەکانی زانسـتی گیانلەبەرناسی. لە پاشەڕۆی ئاژەڵەوە ئەمۆنیای بەرهەمهێناوە.

دەمـــیری (١٣٤٩-١٤٠٥): لـــە ئەوروپیەکانـــە و ٤٠٠ ســـاڵ لەمەوپێش یەکەم ئینسکلۆپیدیای زانستی ئاژەڵناسی نووسیوە.

ئـەبولوەفا (٩٤٠-٩٩٨): زانایـەکی بیرکاریـە و چـەمکەکانی (تان)، (کۆتان)، (سێکانت) و (کۆسـێکان)ی هێنایـە نـاو زانسـتی سێگۆشەوە.

خـــواریزمی (٧٨٠-٨٥٠): نووســـەری یەکـــەم پـــەرتووکی "جەبر"ەو ئەو زانستی "جەبر"ی فێری ئەوروپیەکان کرد.

حونـەین بـن ئیسـحاق (٨٠٩-٨٧٣): پێشـەنگی پزیشـکانی چاوە.

ئیبن جەسار (١٠٠٩): پزیشکێکی موسوڵمانە، یەکەم کەس بوو هۆکار و چارەسەری نەخۆشی (ئاوڵە)ی دۆزیەوە پێش ٩٠٠ ساڵ.

ئـــیبن هـــەیثـــەم (٩٦٥-١٠٥١): فیزیاگـــەرێکی مەزنـــە و دامەزرێنەری زانستی بینینە.

گـــەورەترین زانـــای فیزیـــای موســـوڵمان و پێشـــەنگی ڕۆژئاواییەکانیشە.

ئەم زانایە ڕوونکەرەوەی سیستمی بینین و چاوە.

ئـــیبن ســـینا (٩٨٠- ١٠٣٧): پزیشـــکێکی موســـوڵمانە، بەرهەمەکانی ٦٠٠ ساڵ لە زانکۆکانی ئەورووپادا وەك کتێبی وانەی پزیشکی دەخوێنران.

ئـیبن زوهـد (١٠٩١-١١٦٢): یـەکێك بـوو لـە پزیشـکە هـەرە ناودارەکـانی ئەنـدەلوس، بەرهەمـــەکانی وەك کتێبـــی وانـــەی بنەڕەتی لە زانکۆکانی ڕۆژئاوادا دەخوێنران.

ئـیبن نـەفیس (١٢٨٨-١٢١٠): زانایـەکی موسـوڵمانە، سـوڕی بچووکی خوێنی دۆزیوەتەوە.

ئیدریسـی (١١٠٠-١١٦٦): پـێش حـەوت سـەدە نەخشـەیەکی جیهانی کێشا کە گەلێك لە نەخشەکەی ئێستا دەچێت.

قاضـــی زادە ڕومـــی (١٣٣٧-١٤٣٠): زانایـــەکی دەرئاســـای سەردەمی خۆیەتی لە بواری بیرکاری و گەردووناسیدا.

مەسعودی (٩٦٥): ١٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر هۆکاری دروستبوونی بومەلەرزەی دۆزیوەتەوە.

ئولـوغ بـەگ *[١] (١٣٩٤-١٤٤٩): زانایـەکی گـەردوونناس و حوکمدارێکی ناودار بووە و، لـە زانسـتی سێگۆشـەدا داهێنـەرێکی مەزن بووە.

زەهـراوی (٩٣٦-١٠١٣): زانایـەکی موسـوڵمانە ١٠٠٠ سـاڵ لەمەوپێش یەکەم نەشتەرگەری سـەردەمیانەی ئەنجامـداوە و بـە باوکی نەشتەرگەری لە قەڵەم دەدرێت، هاوکـات چـەندین ئـامێری نەشتەرگەری داهێناوە .

بڕوانـە ! ئیـدی ئەگـەر قورئـان و گـەردوون هاوتـەریبی یـەك خوێنرانەوە چ بەرهەمێکی لێ پەیدا دەبێت !

ئەگەر سەردەمانێکی دوورودرێژە ژمارەی زانایـانی موسـوڵمان هێنـدە کەمـە کـە بـە پەنجـەی دەسـت بـژمێردرێ، هۆکارەکـەی ئەوەیە؛ ئەگەر قورئان خوێنرابێتەوە کتێبـی گـەردوون فـەرامۆش کراوە یـاخود بـە پێچەوانەوە ئەگـەر لـە گـەردوون کۆڵرابێتـەوە قورئانی پیرۆز فەرامۆش کراوە...

---

١ – میرزا محمد طارق بن شاروخ.

# ئایا قورئان باس لە داهێنانە گەورەکانی وەك فڕۆکە دەکات؟

قورئان بەو شێوە ئاشکرایەی تۆ باسی دەکەیت، باسی فڕۆکە ناکات.

نە فڕۆکە و نە ژمارەیەك شتی دیکەی وەك کۆمپیوتەر و تەلەفزیۆن و مۆبایل!

بێگومان ئەمەش هۆکاری خۆی هەیە...

پێش ١٤٠٠ ساڵ، باڵندە و مێشەکان لە ئاسماندا دەفڕین..

کاتێك قورئان نموونەی باڵندەو مێشی دەهێنایەوە، هەموو کەسێك لێی تێدەگەیشت.

تا ١٣ سەدە دوای ئەوەیش باڵندە و مێشەکان هەر لە ئاسماندا دەبینران.

هەرچـی ئـامێرە فڕیوەکـانی دەسـتکردی مرۆڤیشـە، لـەم دوو سەدەیەی دواییدا دەرکەوتن.

ئەگـەر قورئـان باسـی لـە ئامێرێـك بکردایـە کـە تایبەتمەنـدی ئەوەی هەیە بە ئاسماندا دەفڕێت و پەروانەی هەیە، هەیانـە یـەك مەکینـە و هەیانـە دوو مەکینـە، هـی وایـان هەیـە مەکینـەی زۆر بـەهێزە و لـەوانی دیکـە خێراتـر دەفڕێـت، ئـەوا ئـەوکات تـاکو سەرەتاکانی ١٩٠٠ کەس لێی تێنەدەگەیشت.

واتە بەوجۆرە نووری ڕووناککەرەوەی قورئان زیـاتر لـە هـەزار ساڵ بە پەنهانی دەمایەوە و لـە لایـەن مرۆڤەکانـەوە گرنگـی پـێ نەدەدرا.

ئـێ خـۆ قورئـانیش لـەو ڕۆژەوەی نـازڵ کـراوە تـاکو ئـەمڕۆ، بەرامبەر هەموو مرۆڤایەتی پەیامبەخش بووە.

هــەر بەوشــێوەیەش لــەمڕۆوە تــاکو دنیــا لــەناو دەچــێت، پەیامدەرە بە گوێی مرۆڤدا...

هەزار ساڵ پێش ئێستا دەشتەکییەك کە بەسەر پشتی حوشتر گەشتی کردووە چەند پێویستی بە قورئان بووە، بە هەمان شێوە گەشتیارێکی ناو فڕۆکە ئەمڕۆ ئەوەندە پێویستی پێیەتی.

چ کـابرای سـەر حوشـترەکە چ ئـەوەی نـاو فڕۆکەکـە، کـە ئایەتەکانیان خوێندەوە پێویستە تێبگەن و بەشی خۆیـان وانـەی لێ وەربگرن.

بەڵێ، ئایەتەکانی قورئانیش هەروا بوون.

هەمان ئایەت هەم ڕووی لە دەشتەکییەکە و هـەم ڕوویشـی لـە گەشتیارەکەی ئەمڕۆ دەکرد...

بۆیە هەردووکیان توانیان لێی تێبگەن.

چونکە قورئان پەرتووکێکی ئامۆژگارییە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی نێردراوە.

ڕووی دەمی لـە هـەموو کەسێکە و هاوشـێوەی خـۆر –بێجگـە لـەوەی پشـتی تـێ دەکـات– ژیـانی هـەموو کەسـێك ڕۆشـن دەکاتەوە.

لاپەڕەکانی قورئانی پیرۆز پڕن لەو جۆرە ئایەتانە؛ ئەمانەش نموونەگەلێکن لەوانە:

"ئایا سەرنجی وشتر نادەن چۆن بەدی هێنراوە !

ئایا سەرنجی ئاسمان نادەن چۆن بەرزکراوەتەوە !

ئایا سەرنجی چیاکان نادەن چۆن داکوتراون !

ئایا سەرنجی زەوی نادەن چۆن تەخت کراوە !



# فڕۆکە یان مێش؟

بەڕای تۆ بۆچی دەبێت قورئان باسی فڕۆکە بکات! ئایا بەهۆی ئەوەیە کە زۆر گەورەیە و دەفڕێت؟ ئەگەر بابەتەکە گەورەیی و فڕین بێت! ئەوا لەبەر کۆمەڵە خۆر و ئەستێرە و مانگەکان نۆبەی فڕۆکە نایەت.

ئەگەر فڕۆکە بێتە مەیدان و بڵێت "پێویست بوو ئێمەش لە قورئاندا هەبووینایە و ئەوا ئەستێرەیەك بەم جۆرە وەڵامی دەداتەوە: "لەگەڵ ئێمەدا هەر ناویشت لەناو ناواندا نییە! ئێمە لەناو ئەم دەریای ئاسمانەدا فڕۆکەگەلێکی هێندە مەزنی خوای تاقانەین، کە نۆبەی تۆ هەر نایەت. هەم لەکاتێکدا گۆی زەوی هەیە کە ملیارەها مرۆڤ و، ئاژەڵ و، ڕووەك و، دەریا و زەریاکانی هەڵگرتووە بێ ئەوەی هیچ کامیان برژێت و تەنانەت هەست بە فڕینیشی بکەن دەفڕێت، ئیدی نۆبەی تۆ نایەت. ئەوکات کێ گرنگی بە فڕینی تۆ دەدات!"

ئەگەر فڕۆکە بڵێت:

"باشە خۆ ئێمەش ئامێرێکی ناوازەین. ئـەو تەکنەلۆجیایـەی، لە ئێمەدا هەیە لە کێی تردا بەدی دەکرێت! ئایا نـەدەبوو باسـی داهێنانێکی مەزنی وەك ئێمە لە قورئاندا باس بکرایە؟"

لەبەرامبەردا مێشێك بە ویزەویز دێت و دەڵێت:

"هەموو هونەر و تەکنیك و تەکنـەلۆجیای تـۆ لـە پـاڵ بـاڵێکی مندا هەر نرخیشی بـۆ دانانرێـت. ئایا چ فڕۆکەیـەکی دەسـتکردی مرۆڤ لە ناوازەییدا دەگاتە باڵی من؟

هەرکەسێك لە تەمەنیدا یەك جاریش فڕینی مێشی بینیبێـت و وردبووبێتەوە لێی، ئاسایی بوونی تۆی بۆ دەرکەوتووە!

ئەگـەر بابەتەکـە هونـەر و کارامـەیی بێـت ئـەوا لەبـەر مـێش و هـەنگ و باڵنـدەکان، نۆبـەی تـۆ و هـیچ هونـەرێکی دیکـەی مـرۆڤ نایەت.

بڕوانــه خــودای بەدیهێنــەر چــۆن لــه قورئانــدا نموونــەی مــن دەهێنێتەوە:

" خەڵکینـه! پـەنێك هێنراوەتـەوە گـوێی بـۆ شـل کـەن. بەڕاسـتی ئەو بتانەی ئێوە هاواریـان لـیٚ ئەکـەن و هـاوار لـه خـوا ناکـەن ئەگـەر هەموویشـیان خڕببنـەوە مێشـیٚ دروسـت بکـەن ئـەو مێشـەیان پـیٚ دروست ناکریٚ." الحج: ٧٣.



# بۆچی لە قورئانی پیرۆزدا وتراوە:
# "ئایا سەیری وشتر ناکەن
# چۆن خولقێنراوە"؟

هیچ بیرت لەوە کردۆتـەوە؛ قورئـان دەپرسـێت: "ئایا سـەیری وشتر ناکەن چۆن خولقێنراوە" الغاشیة:١٧

ئەوانـەی یەکـەم جـار گوێبیسـتی ئـەم ئایەتـە بـوون خـەڵکی مەککە و مەدینە بوون.

ئۆتۆمبێل ئەمڕۆ بۆ ئێمـە چۆنە، ئـەو سـەردەمەش وشـتر بـۆ ئـەوان هـەمان نرخـی هـەبوو. واتـە نـەبینینی حوشـتر لەلایـەن ئەوانەوە مەحاڵ بوو.

بێگومان تەماشای وشـتریان دەکـرد چـونکە ئاوێتـەی ژیانیـان بوو، هۆکاری گواستنەوەیان بوو، گۆشتەکەیان دەخوارد، شیریان دەدۆشی و بەکاریان دەهێنا، پێستەکەیان دەکردە جل و بەرگ.

ئەگەر وایە بۆچی قورئان دەپرسێت: "ئایا سەیری وشتر ناکەن چۆن خولقێنراوە؟"

بێگومان سەیریان دەکرد بەڵام نەك بەشێوەیەك کە خودای تاقانە بهێننەوە بیریان، خودایەك کە لەو بیابانە گەرم و وشکەدا ئاژەڵێکی خۆڕاگری وەك وشتری بۆ ڕامکردبوون. لە بەرامبەر ئەم بەخشینە مەزنەدا سوپاسیان نەدەکرد. تەنانەت لەسەر پشتی وشترەکانیان دادەبەزین و کڕنوشیان بۆ بتی ڕەق و تەق و بێگیان دەبرد. هەندێ جاریش وشترەکەیان سەردەبڕی و دەیانکردە قوربانی بتەکان.

سەیری وشتریان دەکرد، بەڵام سەیری چۆنیەتی بەدیهێنانە ناوازەکەیان نەدەکرد. چونکە نەیاندەزانی بەدیهێنەرەکەی خودای تاقانەیە، بڕوایان پێ نەدەکرد یاخود بیریان لێ نەدەکردەوە.

بۆیە ئایەتەکە کە دەڵێت: "ئایا سەیری وشتر ناکەن چۆن خولقێنراوە؟" مەبەستی ئەمەیە.

ئەوەی بە ڕاستی سەیری وشتر بکات، دەبێت بیر لە شێوازی دروست بوون و بەدیهێنەرەکەی بکاتەوە!

***



لە دایکمان (عائیشە)یان پرسی: ئایا خوورەوشتی پێغەمبەر ﷺ چۆن بوو؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی: "ئایا ئێوە قورئان دەخوێننەوە؟ خوورەوشتی پێغەمبەر، قورئان بوو..".

حەزرەتی محەمەد ﷺ ڕابەر و پێشەوای موسوڵمانانە لە پەیڕەوکردنی ڕێنمایی و فەرمایشتەکانی قورئاندا.

ژیانی ئەو، ژیانێك بوو تەواو لەبەر ڕۆشنایی و ڕاستەڕێگەی قورئان. لە هەموو هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانیدا قورئانی پەیڕەودەکرد.

ئاخۆ ئایەتی: "ئایا سەیری وشتر ناکەن چۆن بەدیهێنراوە؟"، بە چ جۆرێك لە ژیانی ڕەنگین و بێهاوتای پێغەمبەرمان ﷺدا ڕەنگی داوەتەوە؟

خودی خۆم تامەزرۆی زانینی ئەم بابەتە بووم و بەدوایدا گەڕام لە چەند کتێبێکی فەرموودەدا زانیاریم چنگ کەوت. زاتی پەیامبەر کاتێك سواری وشترەکەی دەبوو ئەم نزایەی دەکرد:

"ئەو خودایەی ئەم وڵاخە سوارەی بۆ ڕامکردووین گەورەترینەو بێگەردە لە هەموو کەموکوڕییەك. ئەگەر خودا بۆی نەکردینایە بە وڵاخی سواری، هەرگیز خۆمان نەماندەتوانی دەستەبەری بکەین.."

بەڵێ، ئەمەیە ئەو تێڕوانینەی کە قورئان داوای دەکرد.

## خۆزگە لە نزیکەوە سەیری وشترمان بکردایە

ئەمڕۆ ئێمە بە سواری وشتر گەشت ناکەین. بگرە هەندێکمان تەنانەت وشتریشمان نەبینیوە. ئاخۆ دەبێت کام لایەنەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕووی لە ئێمە بێت؟ ئێستا وەرە با بیر لەمە بکەینەوە.

ڕاستە سواری وشتر نابین بەڵام خۆ ئۆتۆمبێل و، فڕۆکە و شەمەندەفەر بەکاردەهێنین. ئەمانەش هەریەکێکیان دانەیەکە لە بەخشینەکانی خودای تاقانە.

بەو ژیرییەی خودا پێی بەخشیوین، بەو سرووش و بیرۆکەیەی ئەو خستیە زەینمانەوە، بە بەکارهێنانی ئەو کانزا و ماددانەی خودا بەدیهێنەریانە ئەو هۆکارانەمان دروستکرد و لە ڕێگای کۆمەڵێك تایبەتمەندییەوە کە بەخشیویەتیە ئاو و، هەوا و وشکانی دەتوانین بەکاریانبهێنین.

سەرەڕای هەموو ئەمانە، تانکی سوتەمەنیەکەشی بە هەمان ئەو سوتەمەنیە پڕ دەکەین کە پەروەردگار پێی بەخشیوین.

لەبەرئەوە ئێمەش کاتێك سواری ئەم هۆکارانە دەبین، دەکرێت هەمان دوعای پێغەمبەرﷺ بکەینەوە: "ئەو خودایەی ئەم سواریەی بۆ ڕامکردووین گەورەترینەو بێگەردە لە کەموکوڕی. ئەگەر خودا بۆی نەکردینایە بە سواری، ئەوا هەرگیز خۆمان نەماندەتوانی دەستەبەری بکەین".

پاشان ڕاسته گۆشت و شیری وشترمان دەستناکەوێت، بەڵام خۆ شیرو گۆشتی مانگا بەلامانەوە زۆر بەتامە. بۆیە بە هەمان ئەو شێوازەی قورئان داوامان لێ دەکات، دەتوانین بڕوانینە مانگا و مەڕو بزن و هەموو ئەو ئاژەڵانەی سوود لە شیر و، گۆشت و، پێستە و تەنانەت پەینەکەشیان وەردەگرین. هەردەبێت بەوجۆرەش لێیان بڕوانین...

بەوجۆرەی قورئان فێرمان دەکات، پێویستە بڵێین:

"بڕواننە مانگا و مەڕو ماڵات چۆن بەدیهێنراون"

هەروەها قورئان تەنیا فرمان بە ڕوانین لە وشتر ناکات. بەڵکو دەڵێت سەیری ئاسمان بکەن چۆن بەرزکراوەتەوە، سەیری چیاکان بکەن چۆن داکوتراون، بڕواننە زەوی چۆن تەخت کراوە!

لە ئاسمانەوە تاکو زەوی چاوێك هەڵبهێنین و سەیری هەر شتێك بکەین بە زمانی حاڵ بانگ دەدات بە گوێماندا و دەڵێت؛ سوپاسی ئەو خودایە بکەن کە هەموو لایەکی پڕ کردووە لە خەڵات و دیاری و بەخشندەیی...

# بۆچی درێژترین سورەتی قورئان ناوی (البقرة) واتە مانگایە؟

" بیری ئەوە بکەنەوە کە مووسا بە قەومەکەی وت: بەڕاستی خودا ئەمرتان پێ ئەکا گایێ سەرببڕن و پارچەیێ لە گۆشتی ئەو گایە بدەن لە لەشی کوڕە کوژراوەکەی ناوخۆتان تا بێتە زمان و قاتیلەکەتان بۆ ناونووس بکا. قەومەکەی مووسایش لە وەڵامی ئەمەدا وتیان: ئەی مووسا ئەوە گاڵتەمان پێ ئەکەی؟ مووسایش فەرمووی: پەنا بە خودا لەوەی ببمە نەفام و گاڵتەتان پێ بکەم. " البقرة:٦٧

بەڵێ، درێژترین سوورەتی قورئانی پیرۆز ناوی (البقرة)یە، واتە (مانگا).

لە کتێبی تەفسیردا مانای ناوی سوورەتەکان وەرناگێڕرێت. تەنیا ئاماژەیەك بەوە دەکرێت کە واتای چ دەگەیەنێت. بەڵام ناوی سوورەتەکە وەك خۆی دەمێنێتەوە، چونکە ئەوانیش وەك ناوی مرۆڤ وان.

بۆ وێنە ئەگەر ناوی تۆ (ئاریا) بێت، بە ئینگلیزیش هەر (ئاریا)ی پێ دەوترێت. ئەگەر لە زمانی ئینگلیزیدا وشەیەکیش هەبێت هەمان مانای (ئاریا) ببەخشێت، بەڵام هێشتا کەس نایەت لەبری ناوەکەت ئەو وشەیە بەکاربهێنێت.

لەبەرئەوەی ناوی تایبەت وەرناگێڕدرێت. بۆیە لە کتێبەکانی تەفسیردا نابینیت لە بری (عنکبوت) بنووسرێت (جاڵجاڵۆکە)، هەروەك چۆن لەبری (النحل) نانووسرێت (هەنگ). بە هەمان شێوە لە جیاتی سوورەتی (النجم) ئەستێرە و لە جیاتی (القمر) مانگ نانووسرێت... لە لایەکی دیکەشەوە، ئەم سوورەتانە تەنیا باسی جاڵجاڵۆکە، هەنگ یاخود مانگ ناکەن.

بەهۆی ئەوەی لە ناوەڕۆکیاندا بەشێکی گرنگ دەرهەق بە ئەوان هەیە، بۆیە ئەو ناوە تایبەتانەیان وەرگرتووە.

درێژترین سوورەتی قورئان (البقرة)، تەنیا دەربارەی مانگا نادوێت.

سوورەتی (البقرة) کە دەربارەی دەوترێت: "ئەگەر (الفاتحة) سەری قورئان بێت، ئەوا (البقرة) جەستەکەیەتی"، ئەگەر بێت و ناوی بنێین (مانگا)، ئەوکات نیشانی دەدەین تەنیا باسی مانگا دەکات.

ئەمە لە كاتێكدا، بەهۆی (ڕووداوی مانگاكە)ەوە، ئەم ناوەی لێنراوە.

سوورەتی (البقرة) ٢٨٦ ئایەتە و لە ئایەتی ٦٧-٧١ دا باسی (ڕووداوی مانگاكە)مان بۆ دەگێڕێتەوە.

ئەدی باشە، مادەم سوورەتێكی گەورە بەناویەوە ناونراوە، ئایا ڕووداوی مانگاكە هێندە گرنگە؟

بێگومان! ئەم ڕووداوە -وەك هەندێ كەس لێی دەڕوانن- ڕووداوێك نییە تەنیا باسی سەربڕینی مانگایەك بگێڕێتەوە...



## سەربڕینی مانگاکە

شەوێك لە سەردەمی پێغەمبەر مووسادا، پیاوێکی دەوڵەمەند و ناوداری نەوەکانی ئیسرائیل لەلایەن خزمێکی خۆیەوە کوژرا، بەڵام کەس نەیزانی بکوژ کێیە.

بۆ بەیانی کۆمەڵێك کەس لەسەر تەرمی کابرا کۆبوونەوە. بکوژی ناپاکیش هاواری دەکردو دەیوت: "ئێوە کوشتوتانە، بکوژ ئێوەن!"

ئەوانیش هەواڵی ئەمەیان دا بە حەزرەتی مووسا. پێیان وت: "بە خواکەت بڵێ با پێمان ڕابگەیەنێت بکوژی ڕاستەقینە کێیە، ئەگەر نا دەکەوینە تەنگەژەوە".

حەزرەتی مووسا پێی وتن:

"خودا فەرمانتان پێ دەکات مانگایەك سەرببڕن".

نەوەکانی ئیسرائیل بەم وەڵامە سەرسام بوون. پرسییان:

"ئایا تۆ گاڵتەمان پێ دەکەیت؟"

بەڵام مووسا بەدوور بوو لە گاڵتەجاڕی، وتی:

"پەنا دەگرم بە خوا بچمە ڕیزی نەفامانەوە".

لـه ڕاسـتيدا ئـەوەی نـەوەكانی ئيسـرائيلی سـەرسـام كردبـوو، فەرمانی سەربڕينی مانگا نەبوو بۆ دۆزينـەوەی بكوژەكـە، بـەڵكو (سەربڕينی مانگا) بۆ ئەوان كارێكی ئەستەم بوو...

ئـەوان چـوونی مووسـايان بـۆ كێـوی (طـور) بـە هـەل زانـی و دووبارە وەك پێشتر دەستيان كردەوە بە مانگا پەرستی.

نەوەكانی ئيسرائيل لە ميسردا دەژيان و وەك هەموو كەسێكی ديكە كشتوكاڵيان دەكرد. مانگـاو گامێشييان بـۆ جێبـەجێكردنی كاروبـــاری ڕۆژانـــەيان بـــەكاردەهێنا وەك زەوی كـــێلان و كۆكردنەوەی بەروبوم و... هتد..



لـە نێویانـدا کەسـانێك هـەبوون وابەسـتەیەکی جیاوازیـان بـە مانگـاوە لا دروسـت بووبـوو. ئـەم ڕێزگـرتن و وابەسـتەییە بـە تێپەڕینی کات وای لێهات، کار گەیشتە ئەوەی مانگا و گامێش بە پیرۆز دابنرێت.

پاشان کردنیان بە خوای خۆیان و دەیانپەرستن. وای لێهاتبوو ئیدی کەس نەیدەتوانی دەست بۆ ئەم خوا درۆینانە ببات.

لەکاتێکدا پێغەمبەر مووسا نێردرا بۆیان، نـەوەکانی ئیسـرائیل لە وڵاتی فەڵەستین دەژیان –پێشتر لـە میسـر لەدەسـت زۆرداری فیرعەون هەڵاتبوون– و بیری ڕۆژانی کۆنیان دەکرد.

لەگـەڵ ئـەوەی گـەلێك نیعمـەتیان پـێ بەخشـرابوو بـەڵام بەتاسەوە بیری پیـاز و چـەند بـەروبوومێکی کشـتوکاڵی دیکـەیان دەکـرد. تـا دەهـات حـەزێکی زیـاتر لـە ناخیانـدا بەرامبـەر بەرهەمـەکانی کێڵگـە و مانگـا دروسـت دەبـوو. لـە یـەکێك لـەو ڕۆژانەدا پێغەمبەر مووسا چووە کێوی (طور).

پیاوێـك بـە نـاوی (سـامیری)یـەوە ئەمـەی بـە هـەل زانـی و پەیکەرێکی گوێرەکەی لە ئاڵتون دروست کرد.

له هه‌مان كاتدا په‌یكه‌ره‌كه له‌سه‌ر شێوه‌ی مانگایه‌كی دانیشتوو دروستكرابوو.

ئه‌وه نه‌فامه‌كانی ئیسرائیل ده‌ستبه‌جێ له چوارده‌وری په‌یكه‌ره‌كه كۆبوونه‌وه و پاش ماوه‌یه‌ك ده‌ستیشیان كرد به په‌رستنی.

حه‌زره‌تی مووسا له گه‌ڕانه‌وه‌یدا ڕووبه‌ڕووی ئه‌م دیمه‌نه نه‌خوازراوه بووه‌وه. داخۆ چه‌ندین ساڵه به هه‌وانته باسی تاقانه‌یی خودایان بۆ ده‌كات!

به‌م جۆره، به بیانووی دۆزینه‌وه‌ی بكوژی ڕووداوێك له ڕێگای پێغه‌مبه‌ر مووساوه خودای تاقانه فه‌رمانی سه‌ربڕینی مانگایه‌كی پێ كردن.

سه‌رسوڕمان و نیگه‌رانییان له‌مه‌وه سه‌رچاوه‌ی گرتبوو.

بێگومان ده‌ستبه‌جێ نه‌هاتن مانگایه‌ك سه‌ربڕن. ده‌ستیان تێ نه‌چوو، چونكه مانگا شتێكی په‌رستراو بوو لای ئه‌وان.

كاتێكیش پرسیاری چۆنیه‌تی مانگاكه‌یان كرد، له‌ڕاستیدا ئامانجیان دواخستنی بابه‌ته‌كه بوو.

مانای ئایه‌تی ٦٨-٧١ی سووره‌تی به‌قه‌ره به كوردی له ته‌فسیره‌وه:

(قەومەکــەی مووســا وتیــان: ئــەی مووســا لــە خــودای خــۆت بپاڕێرەوە تـا بۆمـان ڕوون بکاتـەوە ئـەو گایـە چۆنە؟ مووسـا پێـی وتــن: خــودا ئەفــەرموێ: ئــەو گایــە پیرێکــی وەهــا نییــە لــە کارکــەوتبێ‌وجوانێکی وەهــایش نییــە کــاری نــەکردبێ، وا لــەو بەینەدا، ناونجییە. ئیتر ئەوەی ئەمرتان پێ کراوە جێبەجێی بکەن. وتیان: ئەی مووسا لە خودای خۆت بپاڕێرەوە بۆمان ڕوون بکاتەوە ڕەنگەکــەی چــۆنە؟ مووســا وتــی: خــودا ئەفــەرموێت ڕەنگەکــەی زەردێکی جوانی وایە تەماشاکەران دڵخۆش ئەکات. وتیان: ئەی مووسا بپاڕێرەوە لە خودای خۆت کە بۆمان بەیان بکا چییەو چۆن گاییێکە؟ بەڕاستی لێمان تێکچووە. ئەگەر خودا مەیلی لێ بێ بۆمان ڕوون ئەبێتــەوەو ئەمرەکــەی بەجێئــەهێنین. مووســا وتــی: خــودا ئەفەرموێ: گاییێکە تۆڕەو ڕام نەبووە تا ئەرز هەڵبگێڕێتەوەو جووت بکا، ئاوی کشتوکاڵیش نادا. بێعەیبەو یەکڕەنگەو ڕەنگی وەهای پێــوە نییــە لــە ڕەنگــی پێســتەکەی جیــا بــێ. وتیــان ئــا ئیســتە ڕاستەکەت هێنـاو بەتـەواوی ڕوونـت کـردەوە. ئـەوە بـوو گـاییێکی وەهایان سەربڕی‌و نزیك بوو سەری‌نەبڕن.)

بەڵێ، دواجار ئـەم کارەیـان کـرد: واتـە مانگایـەکیان سـەربڕی بەڵام بێگومان دوودڵ و نابەدڵ بوون.

پاشان خودا فەرمانی پێکردن پارچـەیەکی مانگـا سـەربڕاوەکە بدەن لە جەستەی کوژراوەکە. کاتێك ئەمـەیان کـرد بـە فـەرمانی

خودا موعجیزەیەك ڕوویدا و کوژراوەکە زیندووبووەوە، ئەوکات بە زاری خۆی بکوژەکەی دەرخست...

بێگومـان ڕووداوی مانگاکـە کـە درێـژترین سـوورەتی قورئـانی پیرۆز بەناویەوە ناونراوە، ڕووداوێکی ئاسایی نییە.

وانەیەکە دەدرێت بە گەلێك کە سەرەڕای بوونی پێغەمبـەرێکی وەك حەزرەتی مووسا لەنێویانیاندا، لە ڕێگـا دەردەچـن، بـڕوا بـە خودا ناکەن و کڕنووش بۆ مانگا دەبەن..

بـەڵێ، خـوای گـەورە فـەرمانی پێکـردن کـە ئـەو مانگایـەی دەیانپەرست بەدەستی خۆیان سەری ببڕن، بۆ ئەوەی دەست لـە پەرستنی هەڵبگرن.

لـە سـەردەمی ئێستاشـدا لـە وڵاتـی هیندسـتان ملیۆنـان مـرۆڤ هێشتا مانگا دەپەرستن.

ئەگـەر هیندییـەکان ئـەو مانگایانـەیان سـەربڕن، ئـەوا پـاش ماوەیـەك ئیـدی ڕاسـتیی بابەتەکـەیان بـۆ دەردەکـەوێت و لـە پەرستنی دەکـەون. ئەمـە وێـڕای ئـەوەی گەدەشـیانی پـێ تێـر دەکەن.

# هەموو کەسێك مانگایەکی هەیە!

پەرستنی مانگا، تەنانەت بە خەیاڵیشماندا نایەت. وەلێ مانگا بۆ خۆی سیمبولێکە. لەو ڕوانگەیەوە هەرشتێکی دیکە بکەوێتە نێوان خودا و بەندەکانیەوە دەچێتە قاڵبی مانگا پیرۆزەکەوە..

بۆیە هەریەکێك لە ئێمە مانگایەك یاخود زیاتری هەیە و پێویستیشە لەسەری خۆی لێ داماڵێت و سەری ببڕێت. بەپێچەوانەوە هەتاکو سەری نەبڕین، بە جێگیری لەنێوان ئێمە و خودای تاقانەدا دەمێنێتەوە.

کاتی نوێژەکان دوا دەخەین، بەهۆی دەنگی تەلەفزیۆنەوە گوێمان لە دەنگی بانگ نابێت..

زۆربەی کاتمان بە دانیشتن بە دیار تەلەفزیۆنەوە خەرج دەکەین، ئەویش هەروەك خۆی بەردەوام چۆکی داداوە.

بەجۆرێك دەرفەتی خوێندنەوەی قورئان و کتێبی بەسوودی دیکەمان نامێنێتەوە.

دیارە تەنیا لە شتی جوان و بەسوود دوورمان ناخاتەوە، بەڵکو کۆمەڵێك دیمەنی نەشیاو و دەنگ و ڕەنگی جیاوازمان نیشان دەدا کە هەرگیز پێویستمان نییە و سوودی لێ نابینین.

بــەڵێ، بــەم جــۆرە تەلــەفزیۆن هاوشــێوەی پەیکــەرە نەجوڵاوەکەی سامیری هەمیشە بە ڕاسەرمانەوە وەستاوە.

هیچ نەبێت، پێویستە دەنگی ئەو (ببڕین).

ئەگەر دیمەنی نەشیاوی نمایش کرد، دەبێت ڕەنگی ببڕین...

نابێــت وەك نــەوەکانی ئیســرائیل بیــانوو بــۆ ســەرنەبڕینی بهێنینەوە...

مـن نموونـەی تەلـەفزیۆنم بـۆ بـاس کردیـت، ئیـدی تـۆ بـیر لـە (مانگا) جیاوازو جۆراوجۆرەکانی چواردەورت بکەرەوە!

ئێسـتا دیـت، مانگاکـەی سـوورەتی (البقـرة) چـۆن لـە ژیـانی ئەمڕۆی ئێمەشدا جێگای خۆی کردۆتەوە؟

دانایی ناونانی درێژترین سوورەتی قورئان بەناوی (البقـرة)ەوە چەندە قووڵ و ماناداره...



* قورئان: دوایین کتێبی ئاسمانییە خودا بۆ نەوەی ئادەمی ناردووە. خودا قورئانی لە ڕێگای کۆتا پێغەمبەر محەمەدەوەﷺ بۆ نازڵ کردین. وەك چۆن ئیدی پێغەمبەرێکی دیکە ڕەوانە ناکرێت، هەرواش کتێبی ئاسمانی دیکە نازڵ نابێت..

قورئان تاکە پەرتووکێکی پیرۆزە کە لەو ڕۆژەوەی ڕەوانەکراوە تاکو ئەمڕۆ یەك پیتیشی گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە.

هەرچی کتێبە ئاسمانییەکانی پێش خۆی هەیە (واتە: ئینجیل و تەورات) بێبەشن لەم تایبەتمەندیە. ناوەڕۆکی ئەوان گۆڕرا و قسەی مرۆڤی تێکەڵ کرا.

قورئان هاوکات ناوی دیکەیشی هەیە. بۆ وێنە خودا لە قورئاندا چەندین جار بە (کیتاب) ناوی بردووە.

فورقان یەکێکی ترە لە ناوەکانی. ئەم ناوەی لە مانای جیاکردنەوەی باش و خراپ، ڕاستی و بەتاڵ، حەرام و حەلاڵ، ڕاستی و چەوتی هەڵێنجراوە.

ناوێکی دیکەش بریتییە لە (نور).

(شیفاء)یش ناوێکی دیکەیەتی، چونکە قورئان شیفای دڵانە.

کەسانی بەساڵاچوو و نەخۆش لەکاتێکدا بە نزمترین دەنگ بێزار دەبن، بەڵام بە گوێگرتن لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، ئارامی بە دڵەکانیاندا دێت و شادییان بۆ دەگەڕێتەوە. ئەمەش بەهۆی تایبەتمەندی شیفا بەخشینی قورئانەوەیە. هەرکەسێك بیخوێنێتەوەو گوێی لێ بگرێت شیفای بۆ دێت و ئەوەی ڕووی تێبکات بە نووری ئەو ڕووناك دەبێتەوە...

(حکیم) ناوێکی دیاری دیکەی قورئانە. هەندێ جار بە قورئان دەوترێت (حکیم). ئەم ناوە واتە پڕ لە دانایی و سەرچاوەی حیکمەت.

قورئانی پیرۆز ئەمانە و چەند ناوێکی دیکەی هەیە.

* مەصحەف: واتە کۆمەڵە پەڕەیەك کە لە دووتوێی بەرگێکدا کۆبکرێنەوە.

هاوکات ناوێکی دیکەی قورئانە.

* وەحی (سرووش): بریتییە لە ناردنی حیکمەت و زانیاری لە لایەن پەروەردگارەوە بۆ بەندە هەڵبژێراوەکان واتە پێغەمبەران،

جا چ لەڕێی فریشتە (جبریل)ەوە[1] بێت یاخود ڕاستەوخۆ. بۆ نموونە قورئانی پیرۆز لە ڕێگای حەزرەتی (جبریل)ەوە نازڵ بووە.



١- چوار فریشتەی مەزن هەن. میکایل، ئیسرافیل، ئیزرائیل و جبریل. هەریەك لەم چوار فریشتە مەزنە ئەرکی جیاوازیان لە ئەستۆدایە جبریل فریشتەی سرووشە (وەحی). ئەرکی ئەو بریتییە لە بردنی سرووش لە خوداوە بۆ پەیامبەران.

ئەوەی یەکەم ئایەتی قورئان کە دەفەرموێت: " **قورئان بخوێنە لەگەڵ هێنانی ناوی ئەو خوایەی خۆتا کە دروستکردنی هەر دروستکراوێ کاری ئەوە. * ئەو خوایەی ئادەمزادی لە پارچەیێ خوێن دروست کردووە.** " العلق: ١-٢ ، لە ئەشکەوتی (حیرا)ی چیای (نور) بۆ پێغەمبەرمان ﷺ هێنا، جبریل بوو.



* سوورەت: قورئانی پیرۆز لە ١١٤ بەشی جیاواز پێکهاتووە. بەم بەشانە دەوترێت سوورەت. بێجگە لە دانەیەکیان، تەواوی سوورەتەکان بە (بسم الله الرحمن الرحيم) دەست پێ دەکەن.

هەر سوورەتێك و ناوی تایبەتی خۆی هەیە. ناوەکەشی پەیوەندی بە بابەتێکەوە هەیە کە لە ناوەڕۆکەکەیدا باس کراوە.

بۆ وێنە ناوی سوورەتێك (العنكبوت)ە. (العنكبوت) واتە جاڵجاڵۆکە.

لە سوورەتەکەدا ئایەتێك دەربارەی جاڵجاڵۆکە هەیە.

سوورەتی یوسف ناوەکەی لە چیرۆکی حەزرەتی یوسف پێغەمبەرەوە هاتووە.

ناوی سوورەتێکی دیکەش (تین)ە، واتە هەنجیر...

دیارترین سورەت (الفاتحة)یە. ئەمە یەکەم سوورەتی قورئانە، زۆرترین جاریش دەخوێنرێتەوە، چونکە بەبێ خوێندنی (الفاتحة) نوێژ دروست نییە.

درێژترین سوورەت سوورەتی (البقرة)یە، کورتترین سوورەتیش (الکوثر)ە. لەگەڵ ئەوەی تەنیا قورئان لەبەرکەرەکان دەتوانن سوورەتی (البقرة) لەبەربکەن، بەڵام سوورەتی (الکوثر) منداڵانیش دەتوانن لەبەری بکەن.. سوپاس بۆ خودا کە سوورەتی کورتیش هەیە.

* ئایەت: سوورەت لە چەند ئایەتێك پێك دێت. ئایەت ڕستەکانی قورئانە.

هەندێ ئایەت درێژن، کۆمەڵێکیشیان کورت. قورئان لە ماوەی ٢٣ ساڵدا ئایەت ئایەت دابەزی. ١٣ ساڵی یەکەمی سرووش لە مەککە و ١٠ ساڵەکەی دیکەشی لە مەدینە بوو. ئەو ئایەتانەی لە مەککە هاتونەتەخوارەوە پێیان دەوترێ (ئایەتی مەککی)، هەرچی ئەوانەی لە مەدینە هاتونەتەخوارەوە ناویان (ئایەتی مەدەنی)ە.

* **ئایـــەتی مودایەنـــە:** ئایـــەتی ژمـــارە ٢٨٢ی ســـوورەتی (البقره)یە. چەند ڕێسایەکی گرنگی سەبارەت بە وەرگرتنی قـەرز لەخۆگرتووە. هۆکـاری ئاماژەکردنمـان بـە ئایـەتی مودایەنـە لـەم فەرهەنگەدا، ئەوەیە کە درێژترین ئایەتی قورئانی پیرۆزە.

**خۆشنووسانی** نووسەرەوەی قورئان ئـەم ئایەتـە وەك سـەنگی مەحـەك دادەنـێن. هـەر خۆشنووسـێك بـە جۆرێـك ئـەم ئایەتـە دەنووسێتەوە کە یـەك لاپـەڕەی تـەواو پـڕ بکاتـەوە. بـەم جۆرە ژمـارەی لاپـــەڕەکانی قورئـــان بـــە گـــوێرەی خەتـــە جیاوازەکـــان گۆڕانکاری بەسەردا نایەت.

**جوزء:** قورئانی پیرۆز دابەشـکراوە بەسـەر چـەند بەشـێکی ٢٠ لاپەڕەییدا بە هەریەکەیان دەوترێت (جوزء). تـەواوی قورئـان لـە ٣٠ جوزء پێکهاتووە.

**حافظ (لەبەرکەری قورئان):** بەو موسوڵمانانە دەوترێت کە لـە سەرەتاوە تا کۆتـایی قورئانیـان لەبـەرە. پیشـەی (حـافظ)ی لـە سـەردەمی پێغەمبەرمانـەوە ﷺ هەیـە. هـاوەڵان هـەر ئایـەتێك دەهاتـە خـوارەوە دەسـتبەجێ لـە بـەریان دەکـرد. بـەم جـۆرە (حافظ)ەکان پێ دەگەیشتن.

لەو ڕۆژگارەوە تاکو ئەمڕۆ ئـەم کـارە پـیرۆزە درێـژەی هەیـە. کاتێـك لەبەرکـەرانی قورئـان لـە مزگـەوت و کـۆڕ و کۆبوونـەوەی موسـولّمانانـدا بەدەنگـەوە قورئـان دەخـوێنن... هـەمووان بـە ورياييەوە گوێی لێ دەگرن، چـونکە گـوێگرتنیش لـە قورئـان وەك خوێندنەوەی قورئان عیبادەتە.



* خەتم کردن: خوێندنەوەی قورئان لە سەرەتاوە تـا کۆتـایی پێـی دەوترێـت خـەتم کـردن. ئەمـە دیارییـەکی سـوونەتی پێغەمبەرەکەمانە ﷺ بۆ ئێمە.

چونکە ئەو هـەموو سـاڵێك بـە تایبـەتی لـە مـانگی ڕەمەزانـدا، تەواوی ئەو ئایەتانەی دەخوێندەوە کە نازڵ بووبـوون. پێغەمبـەر ﷺ ، پێکـەوە لەگـەڵ فریشـتـەی سـرووش (جبریـل)دا خـەتمی دەکرد.

دوای هاتنە خوارەوەی تەواوی قورئان، دووجار خەتمیان کرد. بەرامبەر و بۆ یەکتری قورئانیان دەخوێندەوە. بەم شێوەیە دڵنیا بوون لە تـەواوبوونی قورئـان بـەبێ کـەموکوڕی. پـاش ماوەیـەکی کەم حەزرەتی محەمەد ﷺ کۆچی دوایی کرد و دوو ئەمانـەتی بـۆ بەجێهێشتین؛ ئەوانیش قورئان و سوننەتن.

ئەمڕۆش موسوڵمانان بەردەوامن لە خەتم کردن. بەتایبەتی لـە مـانگی ڕەمەزانـدا، ملیۆنـان موسـوڵمان ملیۆنـان خـەتم دەکـەن. کەواتە هیچ ساتێك نامێنێتەوە قورئانی تێدا نەخوێنرابێتەوە...

* **پیتەکانی المقاطعـة:** ژمارەیـەك سوورەت لـەجیاتی ئایـەتی درێژ، بە چـەند پیتێـك دەسـت پـێ دەکـەن. بـۆ وێنـە سـوورەتی (یس).

بۆ نموونە سوورەتی (البقرة) بە (الم) دەست پێ دەکـات. ئـەم پیتانە پێیان دەڵێن پیتی موقاتەعە.

ئـەم سـوورەتانە لـە قورئانـدا زۆرن. سـوورەتی (طـه) بـە پیتـەکانی (ط، ه) دەسـت پـێ دەکـات. سـوورەتی ئیـبراهیم بـە (الـر)، سـوورەتی (الشـعراء) بـە پیتـەکانی (طسـم) چـەند سوورەتێکی دیکەی وەك فصلت، شورا، دخان، جاثیـة، الأحقـاف بە (حم) دەست پێ دەکەن.

هەرچـەندە چـەند زانایـەك دەربـارەی مانـای ئـەم پیتانـە بۆچـوونگەلێکیان خسـتبێتەڕوو، بـەڵام هێشـتا نازانرێـت مانـای تەواوەتییان چیە.

لەوانەیشە پێویست بێت نهێنی ئـەم پیتانـە لـە نێوان خـودا و پێغەمبەرەکەیدا بمێنێتەوە.

خودا باشترین زانایە...

* **وەرگێڕراوی قورئان:** بـەدەر لـە زمـانی بنـەڕەتی خـۆی کـە عەرەبییـە، قورئـان بـە هـەر زمـانێکی دیکـە بنووسـرێتەوە ئـەوە وەرگێڕاوەکەیـەتی[1]. بێگومـان وەرگێـڕاو و خـودی شـێوازە ئەسڵییەکەی قورئان نابنە یەك. بۆ نموونـە وەرگێـڕراو لـە نوێـژدا ناخوێنرێتەوە...

---

١- زۆرکەس بە تەفسیر ناوی دەبەن، بەڵام وەرگێڕاوە نەك تەفسیر.

سەرەڕای ئەمە وەرگێڕاوی قورئان گرنگی تایبەتی هەیە.

* تەفسیر: بەو کتێبانە دەوترێت کە ڕاڤە و لێکدانەوەی مانای ئایەتەکانی قورئانیان لەخۆگرتووە. بە درێژایی مێژووی ئیسلام، هەزاران بەرگ تەفسیر لەلایەن زانایانی موفەسیرەوە نووسراون.

* موفەسیر (تەفسیرکار): ئەو کەڵەزانایانەن کە تەفسیری قورئانیان نووسیوە.

* تەجوید: پێویستە خوێنەر، بەگوێرەی یاساکانی خوێندنەوە قورئان بخوێنێتەوە. بۆ ئەمە چەند یاسایەك هەیە. بەم یاسایانە دەوترێت تەجوید.

* حرکة (سەروبۆر): کاتێك ئیسلام بە خێرایی لە جیهاندا بڵاوبووەوە، چەندین کەس کە عەرەبیشیان نەدەزانی موسوڵمان بوون. ئەوان کاتێك قورئانیان دەخوێندەوە، ڕووبەڕووی چەند سەختیەك دەبوونەوە، چونکە لەو سەردەمەدا قورئان ئەو سەروبۆرانەی تێدا نەنوسرابوو کە شێوازی خوێندنەوەی وشەکان دەخەنەڕوو. لە پێناو هەڵەنەکردن لە خوێندنەوەدا سەروبۆر بۆ قورئان نووسرا. ئەمەش ئاسانکارییەکی گەورە بوو بەتایبەتی بۆ ئەوانەی زمانی دایکیان عەرەبی نەبوو.



* ئایـەتی سـوجدە: ١٤ ئایـەت هـەن لـە قورئانـدا کاتێـك دەیانخوێنینەوە یاخود گوێبیستیان دەبین، پێویستە سوجدە ببەین بۆ بەدیهێنەرمان.

مامۆستاو ڕابەرمان پێغەمبەر ﷺ بە هەمان شێوە سوجدەی بردووە. ئەو ئایەتانەش ئەمانەن:

- ئایەتی ٢٠٦ سوورەتی الأعراف - ئایەتی ١٥ سوورەتی رعد
- ئایەتی ٥٠ سوورەتی النحل - ئایەتی ١٠٧ سوورەتی الأسراء
- ئایەتی ٥٨ سوورەتی مریم - ئایەتی ١٨ سوورەتی الحج

- ئایەتی ٦٠ سوورەتی الفرقان – ئایەتی ٢٥ سوورەتی النمل
- ئایەتی ١٥ سوورەتی السجدة – ئایەتی ٢٤ سوورەتی ص
- ئایەتی ٣٧ سوورەتی فصلت – ئایەتی ٦٢ سوورەتی النجم
- ئایەتی ٢١ سوورەتی الانشقاق – ئایەتی ١٩ سوورەتی العلق

* **کێوی نوور:** کێوێکە لە شاری مەککە نزیکەی ١ کیلۆمەتر لە ماڵەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ دوورە. ئەو ئەشکەوتەی یەکەم ئایەتی قورئانی تێدا نازڵ بوو، ئەشکەوتی (حیرا)یە و دەکەوێتە بانی کێوەکەوە.

لەگەڵ ئەوەی بە تەواوی نازانرێت بۆچی ناوی نووری لێ نراوە، وەلێ شاخێکی وەها کە قورئانی ڕووناککەرەوەی جیهانی تێدا هاتبێتە خوارەوە، خۆ ناکرێت ناوێکی دیکەی لێ بنرێت...

* **شەوی قەدر:** ئەو شەوە پیرۆزەیە کە قورئانی تێدا بۆ پێغەمبەر ﷺ نازڵ بوو. شەوێکی مانگی ڕەمەزانە و نزاکانی تێدا گیرا دەبێت. لەم شەوەدا بۆ خوێندنەوەی هەر پیتێکی قورئان هەزاران چاکە بۆ خوێنەر دەنووسرێت، هەر کەسێك داوای لێخۆشبوون بکات تاوانەکانی دەسڕیتەوە. وەلێ بەرواری تەواوەتی ئەم شەوە نەزانراوە.

زانایـــان لەبـــەر ڕۆشـــنایی فـــەرموودەکانی پێغەمبـــەردا ﷺ، گەشـتوونەتە ئـەو بڕوایـەی شـەوی قـەدر یـەکێك بێـت لـە شـەوە تاکەکانی ١٠ شەوی کۆتایی ڕەمەزان.

لەنێو ئەوانیشدا بەتایبەتی جەختیان لە شەوی ٢٧ کردۆتەوە.

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان.

خودایە تۆ پاك و بێ خەوشی و ئێمە هیچ نازانین ئەوە نەبێ کە تۆ فێرت کردووین، هەر تۆ خۆت تەوبەوەرگر و میهرەبانی، خودایە تۆ پاك و بێگەردی و ئێمە هیچ تێگەیشتنێکمان نییە ئەوە نەبێ کە تۆ تێتگەیاندووین، هەر خۆت بەخشندە و خاوەن شان و شکۆی.

٢٣ ڕەمەزانی ١٤٣٤ بەرامبەر ٣١ تەموزی ٢٠١٣

ئەنقەرە.